☆ ناوی کتێب: دیوانی شەیدا

☆ هۆنراوەی: عابد بابان

☆ ساڵی نووسین: ١٩٩٧- ٢٠١١

☆ ئامادەکردن و پیت چنینی: شاعیر

☆ قەبارە: ٢٦٨ لاپەڕە

☆ چاپخانەی رۆژهەڵات- هەولێر

☆ تیراژ: ١٠٠٠ دانە

☆ چاپی یەکەم- ٢٠١١



☆ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٩١١) ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە

هەتا شـیعرێکی مـن مابـێ لـە مـاڵی ئێـوە میـوانم
بەئومێدم کە سوودێ وەرگرن چێــژێ لـە دیـوانم
لە مەکتەبخانەکەی گەل یادگاریـی پاشی مەرگم بێ
ئەگەرچی هەر لە ریزی کۆمەڵی خۆشیـی نەدیوانم

(شەیدا)

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**پێشەکیی:-**

پێش دەسپێکردنی هەر شتێك، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری تەوانا و درووود و رەحمەتی خوا بۆ سەر گیانی حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ.

هەرچەندە گۆڕانکارییەکانی رۆژگار، کاریگەرییان لەسەر تێکڕای لایەنەکانی نووسین دروست کردووە و چەمکی شیعریش لەو گۆڕانانە بێبەش نەبووە، بەڵام ئەوەی جێگای خۆشحاڵییە ئەوەیە کە گەوهەری شیعری کلاسیکی کوردیی، پیرۆزیی و سەنگینیی خۆی لەدەست نەداوە و رەشەبای سەختی ئەو گۆڕانکارییانە نەیتوانیوە رەگ و ریشەی شیعری کلاسیك لەبن بێنێت و سەرچاوەکەی وشك بکات.

وەك دەبینین ئەمڕۆ چەند شێوازێکی نوێ لە (شیعر) هاتۆتە کایەوە و بۆتە شیعری باوی سەردەم و بەپێی رادەی باش و خراپیی بەرهەمەکەش -زۆر تا کەم- کۆمەڵە خەڵك و لایەنگرێکی لەخۆی کۆکردۆتەوە، بەڵام تەنها ئەرك و کارێك کە زۆر سەخت و گران بێت لەم بوارەدا، بڕیاردانە لەسەر شیعرییەتی ئەم جۆرە هەڵبەستانەی کە لەمڕۆدا برەویان پێدراوە و دەدرێت، کە بێگومان لەقاڵبدانی ئەم جۆرە شیعرانە، پێویستی بە کۆمەڵێك کەسی شارەزا و لێزان هەیە کە بتوانن ئەم هاوکێشەیە یەکلا بکەنەوە، کە ئەمەش دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پێناسەی شیعر و لایەنەکانی تری وەك: زانستی رەوانبێژیی و زمانەوانیی و.. هتد، بڕیار لەسەر ئەم یەکلاکردنەوەیە بدرێت، بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنی سۆزداری و دڵ راگرتن و بارودۆخ و سەردەمەکانی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی ئەم جۆرە شیعرە، کە بێگومان ئەمە دەبێتە هۆی دان نەنان بە راستییەکان و خۆپاراستن لە نووسین و وتنی زۆر راستیی زانستیی و ئەدەبیی و ویژەیی، کە ئەمەش کاریگەریی خراپ لەسەر چەمکی ئەدەبیات بە گشتیی و شیعر بەتایبەتیی دروست دەکات.

ئەوەی جێی خۆشحاڵییە ئەوەیە کە دەبینین ناوبەناو بەرهەمی شیعری کلاسیکیی

لـه هەنـدێك شـوێن و لەسـەر دەسـتی چـەند شـاعیرێك سـەرهەڵدەدات و دەبێتـە درێژەپێدەری کاروانی شیعری کلاسیکی کوردیی و -کەم تـا زۆرێـك- ئـەم کانیـاوە دەژیێنێتەوە و تینوێتیی دەیان و سەدان تامەزرۆی شیعر دەشکێنێت.

من لێرەدا نامەوێ هەروا بە باڵای ئەم بەرهەمە شیعرییـەی خۆمدا بڵێم و تەنها بە رووکەش و رواڵەت شان و شکۆی زۆری بۆ پەیـدا بکـەم، بـەڵکو هەڵسـەنگاندنی ئەم دیوانە شیعرییـە -کە بەرهەمی چـواردە سـاڵی تەمەنمـە- دەکەوێتـە ئەسـتۆی کەسانی خوێندەوار و شـارەزایانی بـواری شـیعر و وێـژەی کـوردیی، ئەگـەر ئـەوان پەسەندیان کرد و بە باش لەقەڵەمیان دا، ئەوا منیش خۆشحاڵ دەبم بەوەی کـە ئـەم بەرهەمە لە یەکێك لە تاقەکانی کتێبخانـەی ئـەدەبی کـوردیی، لـە ریـزی دیـوانی شاعیرانی نەتەوەکەمدا جێگەی بکرێتەوە و شوێنێکی بۆ تەرخان بکرێـت، ئەمـەش نەك بۆئەوەی (من وەك شاعیرێك) دەربخـات و بـە خـەڵك و جـەماوەرم بناسـێنێت، بەڵکو بۆئەوەی کەسانی تامەزرۆ بە شیعر و وێژەی کـوردیی، سـوود لـە شـیعرەکانم ببینن و تام و چێژیان لـێ وەربگرن، خۆ ئەگەر تای تەرازووش بەم لایەدا نەشکایەوە و کـەمی هێنـا، بێگومـان ئەوکاتـە منـیش سـەنگ و هێـزی بەرهەمەکـەی خـۆمم بۆ دەردەکەوێت و لەخزمەت خوێنەران و شـاعیرانی بـەرز و گـەورەی نەتەوەکەمـدا داوای چاوپۆشیی دەکەم و دەزانم کە دەبێ هەوڵی زیاتر لەم بوارەدا بدەم.

من لە نووسینی شیعردا رێرەوی شیعری کلاسیکی کـوردیم گرتۆتەبـەر و هـزر و بیری ئەدەبیم لەگەڵ ئەم شێوازەدا گونجاو و تەبایە، بەبێ ئەوەی زۆرم بۆ خۆم هێنابێت لە نووسینی شیعرەکانمدا، ئەمەش خوێنەری هەست ناسك و بیرتیژ دەتوانـێ بڕیـاری لەسەر بدات و هەڵیسەنگێنێ.

شیعرەکانیشم لە بواری شیعری (ئاینیی و پاڕانەوە و عەشق و سـۆز و نیشـتیمان پەروەری و هتد..) خۆیان بینیوەتەوە و لەم خولگەیەدا دەسووڕێنەوە، لێرەدا دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە من شیعرم بۆ رەگەزی بەرامبەر نەوتووە و ئەم لایەنە لە شیعرەکانمدا

ڕەنگی نەداوەتەوە و بەرجەستە نەبووە، ئەمەش بەو واتایە نایەت کە من لایەنی بەرامبەر بە ناسەنگین بزانم و لام ناشایستە بێت، وە دەبێ ئەو ڕاستییەش بزانین کە مرۆڤ ناتوانێ بە زۆرلەخۆکردن شیعر بۆ هیچ کەسێك بڵێت و بیکاتە ئامانج لە سۆزی دەروون و شیعرەکانیدا، بەڵکو ئەوە تەنها پەروەردگاری مرۆڤە کە دەتوانێ خۆشەویستیی لە دڵێکەوە بۆ دڵێکی تر بگوازێتەوە و بیانکاتە (بولبول و گوڵ، تووتیی و شەکەر، شەمع و پەروانە)و هەردوولا یاخود تەنها لایەك گیرۆدەی عەشق و ئەوینی ئەوی تر بکات و دەریای دەروونی بجۆشێنێت و لە بەرامبەردا ئەویش گەوهەری شیعر و هۆنراوەی پڕ لە سۆز و خۆشەویستیی بۆ بخاتە لاوە، ئەم دوو لایەش یان دوو هاوەڵی خۆشەویستی یەکتر دەبن، یاخود مورید و پیرێکی تەریقەت، یان هاوڵاتییەك و نیشتیمانێك دەبن و.. هتد، کە هەریەکێك لەمانە دەبێتە (عاشق)و ئەوی دیکەش دەبێتە (مەعشووق)و بەم جۆرەش گڕی دەروونی عاشق کڵپە دەکات و دێتە جۆش و خرۆش، ئیتر بێباك لەوەی کە مەعشووقەکەی بە حاڵی بزانێت یان نا؟! بەڵکو تەنها بەهۆی سۆزی دەروونی گەرمی خۆیەوە شیعری بۆ دەنووسێت و لە تاریکیی شەودا بەئاگا دێت و بە دڵ پەنا دەباتە بەر (خامە) خوێناوییەکەی و لە وەختی سەحەردا (بای بەیان) دەکاتە قاصید و پەیامی شیعر و خۆشەویستیی بۆ دڵدارەکەی پێدا دەنێرێت.. منیش لە بواری نووسینی شیعری محەببەت ئامێز و سۆزداریدا خامەم خستۆتەگەڕ و بەپێی پێویست و لەکاتی گوشاری دڵ و دەرووندا هۆنراوەم هۆنیوەتەوە و کوڵی دڵی خۆمم دامرکاندۆتەوە، کە لە هەندێك کات و ساتی تایبەت و تەنیاییدا شیعرم بۆ برادەر و دۆستی زۆر خۆشەویست و گیانی بە گیانیی خۆم نووسیوە و خەم و ناسۆر و ناڕەحەتیی دڵ و دەروونم پێ ڕەواندۆتەوە و ئەگەرچی بە تەنها دێڕە شیعرێکیش بووبێت شادیی و ئاسوودەییم پێ بەخشیوە و لە ئاکامدا زنجیرە شیعرێکی شایستە بە دیمەن و شێوەی یاریان لێ دروست بووە و ئەم دیوانەیان لێ پێکهاتووە، کە زۆرێك لە نووسینە

شیعریـــیەکانم بەرهـــەمی (قوتابخانـــەی عەشـــقی مـــەجازیی)ن و ســـەردەمێکی زۆر قوتابیی ئەم قوتابخانەیە بووم و دەرس و موتالام ئەنجام ئـەدا، تـا گەیشـتمە ئـەوەی چەند هەنگاوێك بەرەوپێش بچم و بگوازمەوە بۆ قوتابخانەیـەکی بـالاتر و بـە یـار و مەعشووقێکی تر ئاشنا ببم و پێنووسی شیعرم بۆ وەسف و گەورەیی ئەو بخەمە کار و گەوهەر و مرواریی هۆنراوە بهۆنمـەوە، کـە سـەدان و هـەزاران موریـد و پـەیڕەوانی تەریقەت لەخزمەت ئەم زاتەدا بەهرەمەند بوون و بوونەتە زانا و صۆفیی و شـاعیر و خواناس، کە ئەویش (حەزرەتی شێخ محەممەد عوسمان سیراجەددینی نەقشبەندی)یـە.. بۆیە لێرەدا دەڵێم:- ئەگەرچی شیعرەکانم لە ئاستی گەورەیی و شکۆی ئـەودا نـەبن، بەلام ناتوانم ئەو راستییە بشارمەوە کە ئەم زاتـە بـەرزە بـووە ئوسـتادی عەشـقم و تێکەڵ بە کاروانییانی رێبـازی عەشـقی حـەقیقیی کـردم و خسـتمیە سـەر رێگـەی راستەقینەی خواناسیی و بە دنیای عەشـقی خـودایی ئاشـنای کـردم، کـە ئەمـەش قۆناغی دووەم و جیهانێکی تر بوو لە ئەوین و سۆز و شیعر نووسینم.

شانازیی ئەم بەرهەمە شیعریی و سەروەت و سامانە مەعنەوییەشم، دەگەڕێتەوە بۆ مەرحوومی باوکم: (جەنابی مامۆستا مەلا عبداللەی کاتب- فەنایی) کە هاندەری یەکەمم بـوو بـۆ گرتنەبـەری رێبـازی پـیرۆزی تەریقـەت و خواناسـیی راسـتەقینە، کە خۆی قوتابییەکی بالادەست و قالبووی بۆتەی (مەدرەسەی عەشـقی حـەقیقیی)و خزمەت ئەم ئوستاد و پیرە رۆشن دڵە بوو، کە تا دوا ساتی ژیانی، خامـەی رەوانـی دانەنا و دەستی لەم رێبازە پیرۆزە بەرنەدا.. بۆیە منـیش ئەگـەر سـۆزێکی قـووڵ و راستەقینە و تام و چێژێکی شیرین لـە شـیعرەکانمدا بەرجەسـتە بوویێـت، بێگومـان دەگەڕێتـەوە بـۆ ئوسـتادی قوتابخانەکـە و بـەرزیی سەرچـاوەکە و رێبـازە پـیرۆز و نەخشینەکەی تەریقەتی نەقشبەندیی، وەگەرنا منێکی ناشارەزا مەلەوانی ئەم دەریـا بێ‌بنە نیم و زووبەزوو دەخنکێم، چ جای ئەوەی بە تەنها خۆم بتوانم تاکە گەوهـەر و مرواریـیەکیش لەم دەریایە بەدەس بێنم!.

هەروەها بەهۆی سۆز و شەوقی دڵ و دەروون و لەکاتی تایبەتیدا چەند پارچە شیعرێکیشم بە هەردوو زمانی کوردیی و عەرەبیی بۆ خۆشەویستیی حەزرەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺ نووسیوە و رازی دڵم پێشکەش بە مەقامی بەرز و باڵایان کردووە، وە بەپێی پێویست و لە کات و ساتی تایبەتیشدا چەند شیعرێکم بۆ هاوەڵ و دۆست و خۆشەویستانی خۆم نووسیوە و ناردوومە بۆیان، وە چەند شیعرێکیشم بۆ خاك و نیشتیمان هۆنیوەتەوە و لە هەندێك موناسەباتیشدا چەند شیعرێکم بە چەندین هۆی جیاجیا و هەڵوێست وەرگرتن لە بەرامبەر ناهەقیدا نووسیوە.

زمانی شیعر نووسینیشم بریتییە لە: نووسین بە زمانی شیرین و پاراوی کوردیی بە هەردوو شێوە زاری (سۆرانیی و هەورامیی)و هەروەها زمانی عەرەبیی، بەڵام ئەوەی جێگەی داخ بێت لەلام ئەوەیە کە شارەزایی تەواوم لە زمانی فارسیدا نیە تا بتوانم بەم زمانەش شیعر و هۆنراوە بهۆنمەوە.

شیعرەکانیشم بەپێی (پیتەکانی ئەبجەد) ریزبەند کردووە و دامناون، ئەوەی کە زۆریش گرنگ و جێگەی بایەخ بووە لەلام لە نووسینی شیعرەکاندا، ئەوەیە کە بە وردیی (بەروار و کات)و (شوێن)ی هەریەکێك لە شیعرەکانم دیاریی کردووە و ریزبەندیی بەروارەکانیشم لە هەریەکێك لە بەشەکانی (پیتی ئەبجەد) لەبەرچاو گرتووە و نەمهێشتووە ئەم لایەنە تیایاندا فەرامۆش بکرێت، کە بێگومان ئەم کارەش لە سوود گەیاندن بە بەرهەمی شیعر و ئەدەبی کوردیی خاڵیی نیە و سەنگینیی خۆی هەیە و ناکرێ ئاوڕی لێ نەدرێتەوە، چونکە دیاریکردنی کات و شوێن لە هەر بەرهەم و بابەتێکدا دەبێتە هۆی زیاتر دەوڵەمەندکردن و رێکوپێکیی بابەتەکە. سەرەڕای ئەوەی کە بەپێی گونجان و ناوەڕۆکی شیعرەکان، ناونیشانم بۆ هەریەکێك لە شیعرەکان دەسنیشان کردووە و کردوومەتە پێناسەیەك بۆیان. بەهۆی خۆشەویستیشم بۆ هەندێك لە شاعیران و شیعرەکانیان، سێ پارچە شیعریشم لە شیعری شاعیران کردووە بە (پێنج خشتەکیی)و لەیەکم ئاڵاندوون، کە هیوادارم

لە بـەرزیی و سـەنگینیی شـیعرەکانیانم کـەم نەکردبێتـەوە.. وە هەنـدێك شـیعری چوارینە و تاکیشیان لەخۆگرتووە. لـە هـەمان کاتیشـدا ناویـەناو هەنـدێك شـیعرم لە چەند گۆڤار و رۆژنامـە و سایتێکدا بڵاوکردۆتەوە، کە لە جێگەی خۆیاندا ئاماژەم پێکردوون.. تا ئێرە چەند دێڕێك بـوو لەسـەر ئـەم بەرهەمـە شیعریـیـە و شـێوازی نووسینم لە شیعردا.

بێگومان ئەگەر ئەم بەرهەمەی من بکەوێتە بەردەستی خوێنەران و بڵاوبکرێتەوە، زەمەنێك لە رۆژگار و مێژوو بۆخۆی تەرخان دەکات و بۆ چەندین ساڵ دەمێنێتـەوە، رەنگە کەسانێکی شیعردۆستیش هزر و بیری ئەدەبییان لەگەڵ ئەم بەرهەمـەی منـدا یەك بگرێتەوە و ئاوێتەی یەك بن و بیانەوێ چەند دێڕێك یان چەند لاپەڕەیەك لەسەر ئەم بەرهەمە و ژیانی مـن بـزانن و بنووسـن، جـا بۆئـەوەی خوێنـەران و دۆسـتانی ئەم بەرهەمە ماندوو نەبن و بە ئاسانیی بتوانن زانیاریی لەسەر شیعرەکانم یان ژیانی خۆم بەدەست بێنن، من هەر لە ئێستاوە چەند دێڕێـك لەسـەر ژیـانی گشـتیی خـۆم دەخەمە بەر دیدی خوێنەران، چونکە وەك دەزانین ئەم لایەنە (زانیاریی تەواو لەسـەر ژیان و کات و سەردەم) لـە هەنـدێك لـە بەرهـەمی شـیعریی شـاعیرانی پێشـوودا فەرامۆش کراوە و بە هەر هۆیەك بووبێت پشـتگوێ خـراوە و وەك پێویسـت ئـاوڕی لـێ نەدراوەتەوە، کە ئەمەش نەگەرچی وای کـردووە نووسـەران و لێکۆڵـەرانی دوای خۆیان زیاتر بجووڵێن و هەوڵ و کۆششی فراوانتر بخەنەگەڕ بـۆ ئـەم مەبەسـتە، بـەڵام لە هەمان کاتیشدا بۆشاییـەکی گەورەی لە بەرهەم و دیوانە شیعر و تەنانەت ژیـان و کەسایەتیی و ئاستی زانستیی و کۆمـەڵایەتیی ئەو شاعیرە پێشووانە بەجێهێشتووە و -کەم تا زۆر- کاریگەریی خراپی لەسەر بەرهەمەکانیان داناوە.

جا هەرچـەندە نـە خـۆم تەمـەنێکی ئەوەنـدە زۆرم لـەم دنیایـەدا بەسـەربردووە تا خوێنەر کەڵك لە ژیان و بەسەرهاتی من وەربگرێ و نە ئەم بەرهەمە شیعرییەشـم لە ئاستێکی ئەوەندە باڵادا دەبینمەوە تـا مـن بـە شـیعرەکانم بناسرێمەوە و ببنـە

نیشانەیەك لەسەر من، بەڵام هەر لەبەرئەوەی کە زەمەنێکم لە ژیانی ئەم دنیا پڕ لە چەرمەسەری و ئاڵۆزە داگیر کردووە بۆ خۆم و دەست و پەنجەشم پێنووسیان گرتووە و بەرهەمێکیان لێ دروست بووە، بۆیە ئەگەرچی کەمیش بێ، هەر ناچارم چەند دێڕێك لەسەر ژیان و ئاستی خوێندن و خوێندەواریی خۆم لەم بەرهەمەدا بخەمە روو، چونکە ئەگەر هات و بەرهەمەکەم لای خوێنەران و ئەدەب دۆستان پەسەند کرا و وەرگیرا، ئەوکات ژیاننامە و بەسەرهاتەکانی ژیانم ئەرزشێك پەیدا دەکەن و لە سوودگەیاندن بە خوێنەر خاڵیی نابن.

## کورتەیەك لە ژیاننامەی شاعیر:-

ناوی تەواوم: (عابد عبدالله مصطفی)یە و لە ساڵی (١٩٧٧) لەدایك بووم، لە (نووسین)دا ناوی خۆم لە (عابد بابان)دا کورت کردۆتەوە، نازناوی شیعریشم (شەیدا)یە، کە ئەمەش پەسەندی مەرحوومی باوکمە.

لە تەمەنی شەش حەوت ساڵیدا لەخزمەت باوکم لە (مزگەوتی شێخ بابا عەلی) لە گەڕەکی سەرچیمەن لە سلێمانی دەستم کردووە بە خوێندنی (سیپارە)و بە شێوەی (حونجە) قورئانی پیرۆزم خەتم کردووە، پاشان لە ساڵی (١٩٨٥)دا دەستم کردووە بە خوێندن و لەبەرکردنی دەرسە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمەی زانستی فەقێیەتی و تا کتێبی (جامی)و (سیوطی)یم لەخزمەتدا خوێندووە، پاشان لەخزمەت زانایانی تریشدا خوێندوومە، کە ئەم مامۆستا بەڕێزانەن:-

١- مامۆستا مەلا خالید لە (خانەقای شێخ مەولانا) گەڕەکی هەواری تازە لە سلێمانیی، ساڵی ١٩٨٩.

٢- جەنابی مامۆستا مەلا محەمەد ئەمینی کانیسانان لە گەڕەکی (خەبات) لە سلێمانیی، ساڵی ١٩٩١.

٣- مامۆستا مەلا فەرەج لە (مزگەوتی حاجی حان) لە سلێمانیی، ساڵی ١٩٩٢.

٤- مامۆستا مەلا ئەحمەد لە (مزگەوتی بن تەبەقی عیرفان) لە سلێمانیی، ساڵی ١٩٩٢.

٥- مامۆستا شێخ خالید لە (مزگەوتی دارۆغا) لە سلێمانیی، ساڵی ١٩٩٤.

لەپاش ئەوەی کە بەشێك لە خوێندنی فەقێیەتیم بەو شێوەیە لەخزمەت ئەو مامۆستا بەڕێزانەدا خوێند، بۆ زیاتر درێژەدان بە فێربوونی زانست و هەوڵدان بۆ زانیاریی زیاتر لە زانستەکاندا، لە بەرواری (١٠/١١/١٩٩٠) لە مەدرەسەی دینیی لە مزگەوتی گەورە لە سلێمانی وەرگیرام و قۆناغی ناوەندیی و بەشێکی دواناوەندیم لێرە تەواو کرد و پاشان بەهۆی گواستنەوەی مەدرەسەکە بۆ بینای نوێ بەناوی (مەدرەسەی شافیعی)، لەم قوتابخانەیەدا کۆتاییم بە خوێندنی دواناوەندیی هێنا بۆ ساڵی (١٩٩٥- ١٩٩٦)، کە لەم مەدرەسەیەشدا زۆرێك لە کتێبەکانی تری زانستی فەقێیەتیم لە خزمەت چەندین مامۆستای بەڕێز و پایەبەرزدا خوێند و لێیان سوودمەند بووم.

لەپاش ئەوەی قۆناغی دواناوەندیم تەواو کرد، لە بەرواری (١/١٢/١٩٩٦) لە (پەیمانگای پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان) لە شاری (هەولێر) لەگەڵ کۆمەڵێك قوتابیی تر وەرگیراین و، بە سەرکەوتوویی کۆتاییمان بەم قۆناغە هێنا بۆ ساڵی (١٩٩٧- ١٩٩٨).. لەم قۆناغەشدا لە شاری هەولێر بەپێی پێویست ڕۆژانە لەدوای دەوامی ڕەسمیی دەچوومە خزمەت هەندێك مامۆستای بەڕێز و لێیان سوودمەند دەبووم، کە ئەم مامۆستا بەڕێزانەن:-

١- مامۆستا مەلا عبداللەی قەلات لە (مزگەوتی عومەری کوڕی خەططاب) لە هەولێر، ساڵی ١٩٩٨.

٢- مامۆستا مەلا محەمەدی وەرتیی لە (مزگەوتی شەهید ئیبراهیم) لە هەولێر، ساڵی ٢٠٠٢.

پاشان لە (کۆلێژی شەریعە و خوێندنی ئیسلامیی- زانکۆی صلاح الدین، هەولێر)

بەشی (بنەماکانی ئاین) وەرگیرام بۆ ساڵی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣)و، ئەم قۆناغەشم بە سەرکەوتوویی کۆتایی پێهێنا بۆ ساڵی (٢٠٠٥- ٢٠٠٦).
٣- لە ساڵی (٢٠٠٨)یشدا بەشێکم لە کتێبی (جمع الجوامع) لە خزمەت (د. عثمان هەڵەبجەیی) لە هەولێر خوێندووە.

ئەمە کورتەیەك بوو لە ژیانی زانستیم.. لە بواری نووسین و شیعر دانانیشدا، بێگومان هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانی نووسینی شیعر و هۆنراوەشم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی وەرگیرانم لە (پەیمانگا) کە بەو هۆیەوە لە شاری سلێمانیی دوور کەوتمەوە و پاشانیش لە (١٩٩٧/٤/٣) ماڵمان لە سلێمانییەوە هاتە هەولێر و لێی نیشتەجێ بووین، ئیتر بەهۆی دوورکەوتنەوەم لە برادەران و لەو شارە خۆشەویستە و یادی یادگارییە خۆشەکانی سەردەمی منداڵیی و گەڕەکە کۆن و دڵگیرەکانی سلێمانیی، هەستی شیعر نووسینم جووڵا و دەستم کرد بە نووسینی شیعر و هۆنراوە -کە بەو هۆیەشەوە چەند پارچە شیعر و (قەصیدە)یەکیشم بۆ شاری سلێمانی نووسیوە- لەگەڵ ئەوەشدا ناوبەناو شیعر و بابەتم لە گۆڤاری (پەیڕەو)دا بڵاودەکردەوە، کە لە هەمان کاتدا بووم بە (خاوەن ئیمتیاز)ی گۆڤارەکە و لەم بوارەدا کارم دەکرد و، وردە وردە هەنگاوم نا تا گەیشتمە ئەم ئاستەی ئێستا و کۆکردنەوەی ئەم بەرهەمە شیعرییەم و بڵاوکردنەوەی، کە هیوادارم جێگای رەزامەندیی ئەدیبان و شاعیران و خوێنەران بێت و سوودبەخش بێت.. سەرەڕای ئەو هۆکارانەی سەرەوەش کە باسمان کرد، ناوبەناو شیعری شاعیرانی بەرزی کوردم دەخوێندەوە و تام و چێژ و سوودی زۆرم لێ وەردەگرتن، کە ئەم لایەنەش کاریگەریی خۆی هەبوو لەسەر ئاستی شیعرەکانم.

لە بواری (خێزانیی)شدا لە بەرواری: (٢٠٠٤/٧/٢٩) ژیانی خێزانیم پێکهێناوە، کە (بینایی) هاوسەری ژیانمە و، خاوەنی دوو جگەرگۆشەین بەناوی (لانە)و (عبداللە)، کە بەهۆی سۆز و خۆشەویستیم بۆیان، ئەمانیش لە بەشێکی شیعرەکانمدا جێگای خۆیان کردۆتەوە و بەشێکیان لە شیعرەکانم داگیر کردووە.

لێرەدا تەنها ئەوەندە ماوە بە چەند دێڕێکی کورت کۆتایی بەم نووسینەم بێـنم و هەرچی زووترە خوێنەرانی خۆشەویست بـەم بەرهەمـە ئاشـنا بکـەم و پێشکەشـیان بکەم، ئەگەر هەر کەموکوڕی و هەڵەیەکیشی تێدابوو، داواکارم لێیان بـە گـەورەیی خۆیان چاوپۆشیی لـێ بکەن و ببەخشن، چونکە تەنها خوای گەورە لە کـەموکوڕی و هەڵە دوور و پارێـزراوە، ئیتر بەو هیوایەی توانیبێتم بەرهەمێکی جـوان و بەکـەڵکم پێشکەش بە کتێبخانەی ئەدەبی کوردیی و گەل و نەتەوەکەم کردبێت.

عابد بابان (شەیدا)
هەولێر- پایتەختی هەرێمی کوردستان
٢٠١١/٧/١

# هاواری رۆڵەیەك[*]

هەولێر- ١٩٩٧/٦/١

بابە وا رۆڵەی حەزینت پڕ بە دڵ هاوار ئەکا
پێت ئەڵێ تا کەی فیراقی تۆ دڵم بێزار ئەکا
بۆچی رۆڵەی بێ گوناهت خستە نێو بازاڕی غەم
چی بوو تاوانی! لەبەرچی تەرکی نێو گولزار ئەکا
نەتئەزانی رۆڵەکەی بێ سووچ و بێ تاوانەکەت
ناگرێ بەرگەی غەمی دڵ بۆیە شین و زار ئەکا
دڵ بە یادی شەوقی جارانی لە گولزاری ژیان
چاوەڕوانی تۆیە تا رۆژێ کە رۆحم بار ئەکا
ئەشکی چاوم وا لەبەر ناڵە و فوغان و دەردی دڵ
روومەتی زەردم ئەنەخشێنێ لە شێوەی نار ئەکا
رۆژ و شەو دەشت و بیابانی غەمی دڵ رێگەمە
بۆیە حاڵی بێکەسیم شێوەی لە هی (رێبوار) ئەکا
بەسیە (شەیدا) داد و بێدادی دڵەی بێ تینەکەت
دادی تۆ نادا، هەتا کەی وا بە کوڵ هاوار ئەکا!

***

---

[*] ئەم هۆنراوەیەم لەسەر زمانی هاوڕێی خۆشەویستم: کاك (زاهید فەقێ صالح) نووسی کە بۆ برادەرێکی خۆشەویستی خۆی نارد بەناوی (رێبوار) لە هەولێر، کە باوکی لە جەنگی ئێران و عێراقدا شەهید بووبوو.

# سۆزێك بۆ گۆڤاری دەنگی زانا [*]

هەولێر- ۱۹۹۷/۸/۲۰

حیــبری خامــەی عیلمــە کــاری بۆتــە و ئیکســیر ئــەکا
دەســت و پەنجــەی عالمــە مــاڵی وەتــەن تــەنویر ئــەکا
دەنگــی زانــا زینــدووە بــۆ ناحــەزانی دینەکــەم
بــۆ رژانــی خــوێنی دوژمــن کــاری شــیر و تــیر ئــەکا
هــەرودکو قەڵغانــە بــۆ دینــی مــوبینی (مُصــطَفی)
دەفعــی شمشــێری عــەداوەت زووبــەزوو تەیســیر ئــەکا
بــۆ ظهــوور و نەصــرەتی ئــەم دینــە پاکــە بێگومــان
مــەردی مەیدانــە بــە حەققــەت دوژمنــی یەخســیر ئــەکا
(شــارِح)ە بــۆ ســەر رمــووز و مەنبــەعی ئــەحکامی دیــن
(فِقــْە)و ئایــات و ئەحادیســی (نَبِــيّ) تەفســیر ئــەکا
بــۆ رەواجــی عــیلم و نەشــری زانیــاریی پــڕ هونــەر
مەدرەســەی زانســتە، رۆڵــەی کــورد بــە رۆشــنبیر ئــەکا
گــەر لەســەر ســاحەی خــەباتیش بێتــە نێــو مەیدانــەوە
بــۆ نــەجاتی قــەومی کــوردم رۆژ و شــەو تــەدبیر ئــەکا
حەقیــەتی داوای حــەق و مــافی گەلــی کــوردم بکــا
چــونکە دوژمــن فێــرە دایــم کــورد بــە کــورد تــەنفیر ئــەکا
مــن ئومێــدم وایــە ئــەی دڵ (دەنگــی زانــا) کــپ نــەبێ
تــا لــە سەرچــاوەی دەروونــی میللــەتم تەئســیر ئــەکا

---

[*] ئەم هۆنراوەیە لە گۆڤاری (دەنگی زانا)ی زمانحاڵی یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامیی کوردستان- ژمارە (٦٢،٦٣)ی ساڵی ۲۰۰۲ بڵاوکراوەتەوە.

بۆیــە خامــەم وا بــە کــوڵ کەوتۆتــە مــەدح و وەســفی ئــەو
چــونکە دەنگێکــی حەقــە، ناحــەق بــە حــەق تــەدمیر ئــەکا
ئــەو کەســەی (شــەیدا)یــە بــۆ تەحســینی گــوڵزاری وەتــەن
هــەر لــە ڕێــی زانســتی دینــا داری عــومری پــیر ئــەکا

❊❊❊

## قاصیدی دڵ

هەولێر- ٢٠٠٠/٢/٢٨

یـاران نەویـد و مـوژدەی قاصـید بـەهاری هێنـا
قـووتی هـەموو ژیـان و لـەیل و نـەهاری هێنـا
نـوقڵ و نـەبات و قەنـدی لێـوی بـەباری هێنـا
هـەم شـەهد و شـەکری بـاخ و گـولزاری یـاری هێنـا
ئـەحواڵی شـەوق و شـادیی ئـەو لـەیلی پـاری هێنـا

ئـەمرۆ لـە نیـوەڕۆدا دیـتم کـە قاصـیدێ هـات
قودوومی بوو لە خزمەت یارێ کـە وەسـڵی هـەیهات!
وەك شەوقی ماهی تابان لە نیـوە شـەو کـە هـەڵهات
بـە شۆڕشـی خرۆشـا خـاکی عێـراق و شـامات
مـەیلی ویصـاڵی دولبـەر بـۆ دڵ فشـاری هێنـا

لـەو کاتـەدا کـە لاشـەم مـوقیمی دەشـت و دەر بـوو
رەنجـی هـەموو ژیـانم بـێ سـوود و بـێ سـەمەر بـوو
لە دەشـتی بێکەسـیدا کـە غـەم نەنیسـی سـەر بـوو
لـەو یـاری دیـدە مەسـتم، دڵ چـاوەڕێی نـەزەر بـوو
وەرزی بـەهاری عـومرم، مـەیل و قـەراری هێنـا

ئۆخــەی کــە قاصــیدێکی دڵســـۆز و باوەفــا بــوو
نیگــاهی غــەمڕەوێنی بــۆ دەردی دڵ شــیفا بــوو
جەلسەی حوزووری بۆ دڵ، پڕ عەیش و پڕ صـەفا بـوو
خۆش ئەو دەمەی کە حاڵم بێ مەینـەت و جـەفا بـوو
وەختــێ کــە باســی دیــدە و چــاوی خومــاری هێنــا

بــێ ئیختیــار و بــێ دەس، دڵ کەوتــە بــەزم و شــایی
بــە رەمــزی نــاز و غــەمزە کــە کەوتــە خودنومــایی
تانــەی ئــەدا لــە تــەختی جەمشــید و پادشــایی
وتــی بــە قاصــیدم دڵ، مــنم بــە حــەق فیــدایی
خــۆش ئــەو دەمــەی پــەیامی ئــەو گوڵعــوزاری هێنــا

لــە کــۆڕی بادەنۆشــان بــێ ئیعتیبــار و کــەم بــووم
بە زەوقی دڵ نەخۆشان مــەحرومی نێــو حــەرەم بــووم
بــە قــەولی خۆفرۆشــان زەلیلــی زیــل و بــەم بــووم
طــەریــد و دەرکــراوی بــەردەرکی زیــن و مــەم بــووم
نەویــد و مــوژدە بــۆ مــن هــات ئیعتیبــاری هێنــا

لــە فەصــڵی پــایزا بــوو کــە بــەرگی گــوڵ وەریبــوو
درەختــی بــاخی عــومرم چــون وەرزی بــێ بــەری بــوو
دڵ هەر بە رەنگی بولبول، مــەیلی گــوڵ نــاوەری بــوو
سەرمەستی بۆنی میسك و هەم عوود و عەنبەری بـوو
بــۆ حــاڵی زاری (شــەیدا) مــوژدەی بــەهاری هێنــا

## شەوی دەیجوور (*)

هەولێر: ١٥-١٦/٣/٢٠٠٠

عەجەب ئەمشەو کە ئەیژەن هێرشی هێنا بەسەر نەیدا
لە موتریب دەنگ و ئاوازی تەڵەب کرد، سەربەسەر نەیدا
وتی مەجلیس بەبێ ساقیی، مەحاڵە خۆش و باقیی بێ
کە ئەو بێ، فەزڵی غەم ئەدرێ بەسەر جامی جەم و کەیدا
کەچی بۆ بەختی شوومی جەمعی مەجلیس دەرنەکەوت ساقیی
دەری مەیخانە شێوا، عاشقان کەوتن لە حەوشەیدا
شەوی دەیجوورە ئەمشەو ئەی فەلەك یاخود شەوی یەلدا
کە شەوقی شەمعی دڵدارم لە ساحەی دڵ نیە پەیدا
لە شەودا ماهی تابانی بە غەمزە و نازەوە دەرخست
فیراقم دی لە چاوی پڕ خومار و مەستی بێ مەیدا
لە بازاڕی سەخادا بۆ غەم و هەم قووتی ئەهلی دڵ
بە شێوەی فەخرەوە تانەی لە سفرەی حاتەمی تەیدا
سەراسەر عاشقانی روویی وا تێرکرد لە خوانی خۆی
کەچیی تەنها نەمابوو لوقمەیێ بۆ من لە سفرەیدا
دڵەی بیمار و خەستەی خستە بەردەس جەوری جەللادێ
بەبێ رەحمیی بە قەتڵی واجبم دولبەر شەهادەیدا
منی دێوانە کوشتەی دەستی جەللادێکی دڵڕەق بووم
کە رەحم و سۆزی ئینسانیی نەبوو هەرگیز لە سینەیدا

(*) ئەم هۆنراوەیە لە ژمارە (٥٥)ی (گزنگ)ی گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کورد، لقی کەرکوك- بڵاوکراوەتەوە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧.

بەجارێ جەستەمی تێکەڵ بە خاك و خۆڵ و خوێنم کرد
بە تیری تیژی ژەهراویی لە دەشتی چۆڵ و بێ‌پەی‌دا
فیراقی کردە رێگەی عاقیبەت بۆ قەلبی بیمارم
گڕی بەردایە لاشەم، لەززەتی بینی لە کڵپەیدا
وتی وەسڵت بە گوڵ ئەمشەو نیە، بێ‌شك‌بە فەردایە
دەسا یارانی دڵ، حیکمەت چیە لەم صوبح و شامەیدا
ئەبێ ئاخۆ چ بێ! سوودی رەقیبی پەست و بەدکارم
لە خوێنی ئاڵی لاشەی عاشقێکی وەك منی (شەیدا)

❊❊❊

# بادی سەبا

هەولێر- ٢٠٠٧/٣/١٥

مەرحەبا بادی سەباکەم مەرحەبا
مەرحەبا پشت و پەناکەم مەرحەبا
گەر بەخزمەت یاری دڵ سەنگم گەیی
پێی بڵێ توخوا ئەوەندە دڵ نەبا
یا بە نازی چاوی مەستی دوور لە مەی
با نەدا خەرمانی عومری دڵ بە با
دڵ گرفتاری خەمی هیجری گوڵە
دیدە غەمازێ! عەجایب دڵڕوبا
موددەتێ بوو بەرگی گوڵ پەژموردە بوو
ئێستە وا فەسڵی بەهارە سا سەبا
فرسەتی کەم ماوە، زوو فریاکەوە
تا نەگاتە پایز و وەرزی وەبا
بەڵکو بەم دوو ڕۆژە عومرەی ماوە گوڵ
ماڵی دڵ ڕۆشن بکا وەك کارەبا
چونکە بۆ حیفظی دڵەی (شەیدا) لە غەم
بەرگی گوڵ هەر لایقە، (نِعْمَ الْعَبَا)

***

## خەیاڵی گوڵستان

هەولێر- ٢٠٠٧/٧/١

ئەمڕۆکە دڵ خەیاڵی خەوی بێ سنوور ئەکا

مەیلی وڵاتی گوڵستان و شوێنی دوور ئەکا

ئەمڕۆ چ نارێ بەربووەتە ئەو چناری دڵ

وا قەصدی وەسڵی ڕوویی گوڵ و هەم چنوور ئەکا

گۆمێ کە ئەشکی چاوی من دروستی کردووە

شێوەی لە ڕەنگ و دیمەنی دەریایی سوور ئەکا

زولفێ کە بۆتە بەندی دڵ و تەوقی گەردنم

مەیلی نەمانی ئەهلی دڵ و نەفخی صوور ئەکا

نەغمە و فوغان و شیوەن و ئاواز و سۆزی دڵ

وەك دەنگی زبری زیل و بەمە، لوورەلوور ئەکا

یاران دەخیلە عەرزی گوڵ و لەیلی دڵ بکەن

بۆچی ئەوەندە لەم دەمە وا خوار و ژوور ئەکا

دایم بەداخ و دەردە لەگەڵ عەندەلیبی دڵ

تەمسیلی زوڵم و خەنجەرەکەی سەلم و توور ئەکا

بەینێکە ناهی گەرم و مەراقی فیراقی گوڵ

دێت و بە ماڵ و مەسکەنی دڵدا عوبوور ئەکا

کەی دێ بە شەوق و زەوقەوە ئەو ڕۆژە وا بڵێن

ئەو یاری عیشقە ساحەیی دڵ پڕ لە نوور ئەکا

بۆ حاڵی زاری عاشقی (شەیدا) لە ڕاهی عەشق

گوڵ کاری بۆنی خۆش و بەرامەی بوخوور ئەکا

❊❊❊

# گەشتی خەیاڵ

هەولێر- ٢٠٠٩/١/١٥

وا بەرەو گەشتی خەیاڵی باخی گوڵ ئەمبا سەبا
سا وەرن یاران هەموو هەر بێینە سەر ئەم باسە با
من بەدەس فیتنەی ڕەقیب و گێژەڵووکەی باری خەم
موددەتێکە ون بووە لێم هودهودی شاری سەبا
چاوەڕێی موژدە و نەسیمێکم کە بێ وەختی سەحەر
لەو دیاری عیشق و شاری یار و لەیلی دڵڕوبا
تا بکا سارێژی زامی کۆن و تازەم سەربەسەر
گەرد و تۆزی غەم لە ساحەی سینە و دڵ لاببا
خۆزگە صەییادی دڵەی زارم لە باخی عەشقدا
نەیئەدا خەرمانی عومری پڕ لە شەوقی دڵ بە با
ڕۆژی وەسڵی عاشقان و زەمزەمەی مەستانە بێ
کەس نەبینێ ئەم دڵەی (شەیدا) لەگەڵ گوڵ ناتەبا

***

# گریانی دڵ

هەولێر- ٢٠١٠/١٠/١

بە گریانی دڵـەی بولبـول سـیفەت، بـاخ و چـەمەن گریـا
بە چـۆڵیی بـاخی گـوڵ بـوو، باخـەوانی یاسـەمەن گریـا
لە کۆهی بێستوونی عەشـقی ئـەو شـیرینە، وەك فـەرهاد
ئـەوەن گریـا دڵـەی میحنەتـزەدەم، دار و دەوەن گریـا
کـە گـوڵ تـیری بـە لاشـەی بولبـولی بـێ ڕۆحـەوە بینـی
وەها زامی بەسۆ بوو تیری، گوڵ خۆی چـەن بەچـەن گریـا
مەحەببـەت فێـری کـردم حورمـەت و ڕێـزی تەمـەن بگـرم
بـەڵێ هـەر بۆیـە دڵ بـۆ پـایزی وەرزی تەمـەن گریـا
نەسیم ئەمڕۆ لە خەو هەستا سـەحەر، بـردی پـەیامی دڵ
وەڵامی گوڵ نـەبوو پەیـدا و دڵ شـەق بـوو نەمـەن گریـا
گەلـێ پەروانە بۆ شەوقی جەماڵ و حوسنی شـەم سـووتان
کەچیی باکی نەبوو ئـەم لـەم هـەموو گریانـە چـەن گریـا
خەڵاتی گوڵ لەبۆ ئەم عاشقەی (شەیدا)یە هـەر خـەم بـوو
کەچیی ئەم بۆ بەراتی نـوقڵ و هـەم دووڕی یەمـەن گریـا

***

## رازی دڵ[*]

ئەستەمبووڵ- خانەقای حەزرەتی شێخ ٢/٨/٢٠٠٠

مەدەد پیری دڵ ئاگا، دوور لـە گیانـت — مـنم کوشـتە و شـەهیدی پەنجـەکانت

ئەگەر جارێ لە کوشتەی خۆت بپرسـی — رەوایــە بـۆ بڵنــدیی عیــزز و شــانت

بە شێوەی قەهر و طەردی دڵ مەفەرموو — نیــە چــارێ لــەبۆ دەردی گرانــت

بە سەر سەرگەردی گەرد و گـەردنت بم — بـە گیـان و دڵ فیـدای رۆحـی رەوانـت

هەموو عومری شـەو و رۆژم لـە دنیـا — بــەقوربانی ســـەعاتێکی شــــەوانت

ســەرم کەوتۆتــە بــەرپێت و زەلــیلم — وەریگێڕە بە هـەردوو دەسـتی جوانـت

بـە جـەزبت جازیبـەی نەفسـم بکێشـە — کەمەندکێشـی‌کـە بـۆ نێـو دیوەخانـت

تەوەججوهـ کە لە نەفسی سـەر جـەبینم — هــەتا عالــەم نـەڵێ تیفلـی جـەبانت

زەلیلـی نـەفس و شـەیطـان و هەوایـە — بــەجێماوە لـــە جــەمعی کاروانـــت

دەبـا سـاحەی دڵـەی وێرانەکـەی مـن — ببێتــە جێگــە دەســتی میهرەبانــت

بە شەرتێ تـۆ قبـوولم کـەی، عـەزیزم — بــە دڵ مــن دێمــە ریــزی رێڕەوانــت

ئەگەر زامی دڵـم سارێــژ ئەکـەی تـۆ — لەبەرچـی داتــە بــەر تـیری کـەوانت!

مەگەر نەتـزانی مـن عاشـق بـە رووتم — بــەجارێ بوومــە شـێت و رەوزەخوانـت

ئەگەر هیممەت بفەرمووی، من یەقینم — لــەبۆ تــۆ وەك یەکــە مــان و نـەمانت

لـە بـابی لـوطفی پیرانـەت لەگـەڵ دڵ — دەلیلی بەسطە تێـری‌کـەی لـە خوانـت

بجووڵێنە بە لوطفـت دەسـتی هیممـەت — لەسەر لەوحەی دڵەی تێکەڵ بـە ژانـت

دەخیلـت بم بـە جـورمی مـن نـەگۆڕی — گوڵاڵـەی سـوور و رەنگـی ئەرخـەوانت

بـە یـادی تـۆوە دڵ هـەر چـاوەڕێیــە — لــەبۆ ســروە و نەســیمی دەم بــەیانت

بە دڵ عـەرزت ئەکا (شـەیدا): عـەزیزم — ئــەتۆ بــاخی گــوڵ و مــن باخـەوانت

---

[*] ئەم هۆنراوەیە لە ژمارە (٢٣)ی گۆڤاری (پەیڕەو) ساڵی ٢٠٠٠ بڵاوکراوەتەوە.

# شێوانی بەزمی دڵ(*)

هەولێر ١-٢/٩/٢٠٠٢

ئەمشەو کە لەپڕ ساغیر و پەیمانە پەکی کەوت
زەوقی دڵی پیری مەی و مەیخانە پەکی کەوت

تیری غەمی گوڵ بوو کە نیشانەی دڵی پێکا
بەم داخەوەماڵی دڵی وێرانە پەکی کەوت

گوڵ پاکی وەریی، رەنگی نەما دیمەنی گوڵزار
شێوا چەمەن و بولبولی تاقانە پەکی کەوت

شەم شەوقی نەما، ماهی مویارەك گوزەری کرد
دوو باڵی شکا بەم شەوە پەروانە پەکی کەوت

دولبەر کە نیقابی روخی کێشا بە سەریدا
بەزمی طەرەب و جیلوەیی جانانە پەکی کەوت

وا دەستی بەسەر عەقڵ و دڵی ئەهلی غەما گرت
سەرمایەیی سەد عاقڵ و فەرزانە پەکی کەوت

دوو زولفی رەشی یارم ئەوەن تێکەڵ و پڕ بوو
نەیتوانی کە صاف و صەفی‌کا شانە پەکی کەوت

شیرین کە بەدەس عەشقەوە تاڵیی غەمی نۆشی
لەم بەردەردەدا کۆکەنی دێوانە پەکی کەوت

خوێنی دڵی من تێکەڵی نێو کووپەیی خوم بوو
هەر بۆیە کە وا صەنعەتی خومخانە پەکی کەوت

---

(*) ئەم هۆنراوەیە لە گۆڤاری (شارەزوور) ژمارە (١٧)ی ئازاری ٢٠٠٧ بلاوکراوەتەوە.

ئــەی دڵ وەرە گــویێ بگــرە لــە نــەی، چــەندە حەزینــە

بڕوانــە کــە چــۆن شۆڕشــی مەســتانە پــەکی کــەوت

بــەم هیجرەتــی پــڕ میحنەتــە ئــەم لەیلــە کــە کــردی

میهــری دڵ و گــوڵ، نولفــەتی ڕەندانــە پــەکی کــەوت

هــەر وازی نــەهێنا دڵــی (شــەیدا) لــە ڕەهــی عەشــق

تا خەســتە بــو وەك مــورغی ســبەینانە پــەکی کــەوت

❊ ❊ ❊

## داوی محەببەت

هەولێر- ١٠/١٠/٢٠٠٣

دڵــم کەیلــە لــە خوێنــاوی محەببــەت
عــــەزابم دی لــــەپێناوی محەببــــەت
خــەیاڵی مــن ویصــالی دولبــەرم بــوو
کەچیی لــێم بــوو بــە تــاڵاوی محەببــەت
لــەلایێ جــەرگ و دڵ ئــەبڕێ بــەجارێ
بــە تیغــی پــڕ لــە زاخــاوی محەببــەت
لەلایێ تــر ئەگــەر مــەیلی ببــێ لــەیل
غــەمیشی خۆشــە هــەر داوی محەببــەت
گەلــێ تاڵیی غــەمم نۆشــیی لــە ژینــا
بە رەنگــێ کەوتمــە نێــو راوی محەببــەت
کە بوومە عاشقێکی شــێت و (شــەیدا)
ژیـــام و بوومـــە فـــەوتاوی محەببـــەت

❊❊❊

# تاڵاوی جەفا

هەولێر- ٢٠٠٤/٢/١٣

ئـەی دڵ چـیـە ئـەم بـاری غـەم و شـیـوەن و زارت
بۆچ دەرد و غەمە قووتی هەموو لەیل و نـەهارت
کوانـێ فـەرەح و شـەوقی دڵ و وەرزی بـەهارت
کوا هودهودەکەی شاری سـەبا وەك دەمـی پـارت
تا کەی لە چەمەن شین و لە جێگەی گوڵە خـارت!

ئەمڕۆکـە سـەبا مـەیلی نیـە، پـەرش و بـڵاوە
چـون ڕەونـەقی بـازاڕی چـەمەن پـاکی شـکاوە
بولبـول نیـە شـەوقی، کـەڕ و کـاس و حەپەسـاوە
پەروانە لە دووریی مـەهی شـەم، ڕەنگـی نـەماوە
ئـەی دڵ وەرە سـەیریکە کـە چـۆن عـاجزە یـارت

سـا بەسـیە ئـیتر شـین و گـرین، ناڵـە و ڕۆڕۆ
سوودی چـیە ئـەم حاڵـەتی غـەمباری‌یـە بـۆ تـۆ
گەر گوێ لە فوغانت نەگرێ لەم دەمـە گـوڵ، خـۆ
وا چاکە نەکەی دەنـگ و هـەرا، چـون نیـەتی بـۆ
میهری لـەگـەڵـتـدا نیە نـەو لـەیـلـی عـەیـارت

چەند ساڵە کە گیرۆدەیی عیشق و غەمی لەیلی
عومرێکە لە تاڵاوی جەفا دڵ پڕ و کەیلی
لەم عالەمە تۆراو و بەبێ ئولفەت و مەیلی
دایم وەکو ئەستێرەیی پڕ وەیلی سیودیلی
هەر کۆڵی غەم و تیری گوڵ و میحنەتە بارت

کەی لایقە ئەم جەور و جەفا و میحنەت و دەردە
لەو یاری وەفادار و دەروون بێ غەش و گەردە
ئەو ئاهی دڵی گەرم و هەناسەی غەم و سەردە
بۆ عاشق و (شەیدا)یەکی وەك تۆ کە نەوەردە
لەو دەشت و بیابانە، کە فەوتاوی بە زارت

* * *

## هەنگامی سەفەر

هەولێر ٢-٣/١١/٢٠٠٨

ئەمڕۆ لە خەوی غەفلەتی گوڵ، دڵ بەخەبەر هات

بولبول لە چەمەن وا بە خەم و شین و چەمەر هات

پێی زانی کە شێوانی چەمەن کاری ڕەقیبە

بۆ زامی دڵی، نەشتەری موژگان و سوپەر هات

پەژموردەیە وەك بولبولی دێوانە، دڵی من

هەر بۆیە بە داخ و غەمە، خوێنی لە جگەر هات

لەکوێیە سەبا هودهودەکەی شاری سەباکەم

وا عومری عەزیزم چووە، هەنگامی سەفەر هات

تا کەی بە غەمی لەیلەوە من سەرفی تەمەن کەم

وا وادەیی ڕۆیشتنە هەم کاتی حەزەر هات

عومرێ بو کە من مونتەزیری پەیکی سەبا بووم

ئەمڕۆکە شوکور طەلعەتی بوو وەختی سەحەر هات

هەر لەو دەمەدا پیری مەی و نەشئەگەری دڵ

وەك ماهی موبارەك بە مەهی شەوق و نەزەر هات

یەك یەك هەموو مەستانی حەرەم پاکی لەخۆ چوون

ساقیی کە لە سووچی دەری مەیخانەوە دەرهات

ئۆخەی دڵی (شەیدا)یی منیش کامی بەدیی بوو

باخی ئەمەل و عەشقی گوڵ و لەیلی وەبەر هات

***

# نەسیمی پار

هەولێر- ١/٥/٢٠٠٩

ئەی گوڵ دەسا نەسیمێ با بێ بە نەزمی پارت
بۆ حاڵی بولبولی دڵ، سووتاوی نوور و نارت
با بەزمی غەم نەمێنێ بۆ مەست و دڵفگارت
پڕ شەوق و باصەفا بێ، هەم لەیل و هەم نەهارت
ئامادە بێ چەمەن با بۆ فەسڵی نەوبەهارت

ئەی دولبەری دلآرا، عەشقت کە قووتی ژینە
بۆ حاڵی عاشقی رووت، هۆی ئافەت و برینە
بەزم و بیساتی نازت، ئەسبابی شۆر و شینە
مەیلێ بفەرمو جارێ، ئەحواڵی دڵ ببینە
تاوێ لە دڵ نەزەرکە بەو چاوی پڕ خومارت

عومرێکە من کە وێڵی عەشقم لە دەشت و سارا
غەم قووتی رۆژ و شەومە، ژینم نەما لە شارا
بێبەش لە شەوق و شادیی لەم فەسڵی نەوبەهارا
رەحمێ بە دڵ بفەرموو، لوتفێ بە من نیگارا
یەك لەحزە دەرخە ماهی حوسن و قەدی نیگارت

مـن عـاشقی جەماڵ و ئەو حوسنی ماهی تـۆ بـووم

بەند و ئەسیری تـەوقی زولفـی سـیاهی تـۆ بـووم

بۆ تیری میحنەت و غەم، پشت و پەناهی تۆ بـووم

بۆ رۆژی مەقدەمی تۆ، پـەرژینی راهـی تـۆ بـووم

(شەیدا)ی ویصالی رووتم بـەو چـینی گوڵعـوزارت

***

# بارانی خەم(*)

هەولێر- ٢٥/١٠/٢٠٠١

فەلەك ئەمڕۆکە بارانی خەم و شینی بەسەرما کرد
بە بێباکیی چەها تیری بەنێو بەندی جگەرما کرد
عەزیزم، گەر بە دیققەت تێبفکری تۆ لە ئەحوالم
ئەزانی دەردی غەم چۆن بەرهەمی عومری بە ئاوا کرد
لە ڕێبازی فنوونی بەزمی عەشقا بێخەبەر بووم من
کەچیی مەعشووقەیێ هات و لە من وا خۆی بە لەیلا کرد
لە مەکتەبخانەیی دڵ، ئەلف و بێ یەك فێر نەبووبوم من
کە فکر و هۆشی گیرۆدەیی دەرس و موتالا کرد
منی کێشایە نێو بازاڕی عەشق و بەزمی دڵداریی
بە ناهەق بێکەسێکی وەك منی بێماڵ و مەئوا کرد
وتی لەم بەحرە هەر ژیری نەچێژێ قەترەیێ، شێتە
دڵەی دێوانەمی بەم دەنگوباسە شێت و (شەیدا) کرد

***

(*) ئەم هۆنراوەیەم لە وەڵامی نامەیەکی برای بەڕێز: کاك (عەدنان سەیوانیی) لە سلێمانیی نووسی.

## مەزهەری دنیا

هەولێر- ٢٠٠٨/٦/١٢

چ سەیرە مەزهەری دنیا کە مەنصووری بەدارا کرد
چها بێنەسڵ و فەسڵیشی بە جەمشید و بە دارا کرد
لە ساحەی گوڵشەنی حوسنی وەفادا بێوەفایێکە
حەبیب و عاشقێکی بەو شکەوتی ژەهری مارا کرد
لەگەڵ پیرێکی صیددیقا غەم و ناسۆری پێنۆشیی
کە خۆی و هاوەڵی گیانیی بە ناچاریی بە غارا کرد
ئەگەر دنیا لە دینا بایەخێکی زۆری ببوایە
نە لایق بوو کە ئەو کارەی لەگەڵ صیددیق و یارا کرد
بە زاهیر گوڵشەنێکی پڕ لە رەنگ و دیمەنە، ئەمما
لە باطیندا ببینە چی لەگەڵ لەیل و نەهارا کرد
ئەوەی رۆژ و شەوێ تووشی نەهات و دەرد و میحنەت بوو
لەلای وایە کە رۆژ و شەو ستارەی نەحسی کارا کرد
لە کۆڕی ئەهلی دنیادا مەساری سەیری وا گۆڕیی
کە وا لوتفی لەگەڵ جەمعێکی پەست و بێشومارا کرد
ئەوەی ژیرە لە ژینا هەروەکو ئەم عاشقەی (شەیدا)
بە دڵ ئەم ماڵی دنیایەی بە ناخی ئەرزی تارا کرد

***

# مەشقی عەشق

هەولێر- ٢٠٠٨/٧/٧

عەزیزم دڵ بە شەوقی مەشقی عەشقی تۆ بووە موعتاد
لە مەیخانەی غەمی تۆدا وەها خستوویە تۆشە و زاد
ئەگەر وەسفت لە من پرسن، ئەڵێم زاتێکە شاهی من
کە ئوستادی ئەزەل بەخشیویە پێی خەرقەیی ئیرشاد
وتم یاران مەکەن لۆمەم کە تەرکی بەزمی دنیا کەم
ئەسیری عەشقی شیرینێکی بێوێنەم، وەکو فەرهاد
جەوانمەردێکی خاوەن هیممەت و بازوو لە مەعنادا
بە زاهیر گەرچی پیرێکە سەر و سیما سپیی، ئوفتاد
وتم قوربانە دیدەم نابەڵەد بووم تازە من فەوتام
دەسا لەو وەختە بۆلای من کەسێکت بۆچی رانەسپارد
لە وادەی هاتن و شێوەی رەقیبم بێخەبەر بووم من
هەتا من ئاوڕم دا، ئەو بەهاری عومری کرد بەرباد
بە ئاسانیی کە خۆم تەسلیمی شمشێری بڕندەی کرد
وەهام زانی کە تۆ بۆ من رەوانەت کردووە جەللاد
کە دیتم حازرە بۆ قەتڵی دڵ، جانا وتم تازە
لە تۆڵەی خوێنی من هیچ رامەوەستە و گەردنت ئازاد
لە دنیادا چ تاوان و خەتاییەکی هەیە خورشید
بە رووناکیی کە شەوقی رووی نەبینێ کوێری مادەرزاد
کە شەمسی رووی درەخشانت نەبینم، کەی خەتابارم
منی (شەیدا)ی جەماڵی تۆ، وەکو پەروانە بێفەریاد

***

# زامی کۆن و نوێ

هەولێر- ١٩٩٩/٣/٥

ئەی دڵەی تێکەڵ بە زامی کۆن و ئازارێکی تر
تۆ بڵێی یاری عەزیزم بێتەوە جارێکی تر
یا جەماڵ و حوسنی رووی دەرخا وەکو نووری قەمەر
لابدا پەردەی رەشی پڕ ئێشی شەوگارێکی تر
یا نەبێ هەردەم وەکو دێوانە بم، سەحرا نوشین
بێجگە خاری غەم نەبینم رەنگی گوڵزارێکی تر
من لەگەڵ دڵداری دڵدا وەك شەم و پەروانە بووین
ئێستە وا کەوتوومە نێو گێژاوی رووبارێکی تر
بۆ بەتەنها من لەچاو یارانی نێو صەحنی حەرەم
پێم رەوا هەرگیز نەبینن غەیری غەم کارێکی تر
بۆ دڵم پۆڵایە من! سەرباری ئەشکەنجەی رەقیب
وا بە رۆژ و شەو بچێژم زوڵمی غەددارێکی تر
بۆ وەڵامێ رووم لە قاصید کرد، وتی سەرباری غەم
تازە لەم دنیا مەحاڵە وەسڵی تۆ جارێکی تر
گەر تەماداری نەجاتت بێ لە شین و زاری دڵ
بۆ عیلاجی زامی سەختی تۆ نیە چارێکی تر
هەر نەبێ قووتی شەو و رۆژت غەمی جانانە بێ
بێجگە شیوەن قەت نەکەی تۆ دەنگ و هاوارێکی تر
دەی ئەبێ چی بێ گوناهم، داستانی عەشقی من
بۆ بگاتە مەجلیسی نامەحرەم و شارێکی تر

پێـی وتم قاصـید ئـەبێ دڵ دەیـت و بسـپێری سـەرت
ئێرە ڕێگـەی عەشـقە نـەك دووكـان و بـازاڕێكی تـر
مـن ئەوەنـدەم خـاری غـەم لـەم ڕێ بـە دڵـدا ڕۆیـوە
تـازە بـێ‌بـاكم لـە نـووكی تیـژی دەم خـارێكی تـر
دەی كە وابێ شەرتە دوو دیـدەم هـەتا بـازاڕی حەشـر
قەت نەكا سەیری جـەماڵی وەجـهـ و ڕوخسـارێكی تـر
گەرچـی ئێسـتا نیشـتەجێی مـاڵ و دیـاری غوربـەتم
ڕۆح و دڵ بەنـدن بـە ڕەنـگ و دیمـەنی شـارێكی تـر
شاری یار و موڵـكی بابـان و وڵاتـی ئـەهلی عەشـق
بۆیە ئەم (شـەیدا) شەهیدی عەشـقە نـەك بـارێكی تـر

❊❊❊

# بولبولی دڵ

هەولێر ٩-١٠/٨/٢٠٠١

سەردەمێ بوو بولبولی سەرمەستی ئاوازی سەحەر
هەر لە دووریی رەنگی گوڵ عومری عەزیزی بردە سەر
بۆ کڵۆڵی و حاڵی شێواوی بەدەس فەوتانی گوڵ
خاك و خۆڵی هیچ دەر و دەشتێ نەما نەیکا بەسەر
وا دڵەی زاری منیش ئەمڕۆ لە دووریی مەیلی لەیل
بولبول ئاسا شین نەکا، لەیلیش لە حاڵی بێخەبەر
هەروەکو مەجنون بە یادی وەسڵی لەیلا رۆژ و شەو
دەشت و هەرد و کۆ ئەپێوێ، وێڵ و تەنها دەربەدەر
هەر تەماداری نەسیمێکە لەخزمەت گوڵ کە بێ
پڕ بکا سینە و دەماغی، عەتر و عەنبەر سەربەسەر
بۆ سەرا سەرچاوەیی ئاوی حەیات و وەسڵی گوڵ
عاشقی دێوانە هەر ناچارە رێ بگرێتە بەر
لازمە رۆح و سەر و ماڵی فیداکا عاقیبەت
ئەم دیاری عیشقە رێگایێکی دوورە و پڕ خەتەر
هەرکەسێ رێبازی عەشقی دڵبەری کرد ئیختیار
تازە تا ماوە ئەبێ خۆشیی لە دڵ دەرکاتە دەر
مەرحەلەی عەشقی مەجازیی طەی بووە، قوربانتم
با نەمامی گوڵشەنی عەشقی حەقیقیی بێتە بەر
ئەم دڵەی (شەیدا) سیفەت وادەی بە دڵبەر داوە خۆ
تا بمێنێ لەم جیهانە بەرنەدا رێگەی سەفەر

✻✻✻

## کوورەی دەروون

هەولێر- ٢٠٠٣/١١/٨

فیراقی تۆ غەمە دیدەم، ویصالت هەر لە غەم غەمتر
نسیبی نەگبەتیی حاڵی منە میهرت بە دڵ کەمتر
هەتاکو زەڕڕەیێ شادیی لە دڵدا جێگەیێ ئەگرێ
کەچیی لەملا هوجوومی غەم لە دەوری حازرە و جەمتر
ئەگەرچی من دەمێ بوو مەحرەمی ئەسراری عەشقت بووم
بەڵام ئەمڕۆ رەقیب لێت بۆتە ئەهلی راز و مەحرەمتر
ئەوانەی قەدری تۆ قەت وەك منی دێوانە نازانن
ئەبینم هەر ئەوانن وا لەپێش و خاص و ئەقدەمتر
دەسا توخوا سەبا با بێ لە تۆوە نەشئەیێ بۆ دڵ
لە سروەی پڕ لە شەوقی صوبحدەم بێترس و نەسلەمتر
لە میحنەتخانەکەی شێواوی بەزمی مەجلیسی یارم
مەگەر هەر کوورەیی دڵ بێ لە کوپەی خوم جەهەننەمتر
شەهیدی عەشقم و خوێنی جگەرمە شاهیدی دەعوا
وەها بۆیە بووە خوێنم لە رەنگی سووری خوم خومتر
عەجەب ناهوو میسالێکە! ئەوەن غەممازە یاری من
لە ئاهووی چین ئەچێ، بەڵکو لەویش ئازاتر و رەمتر
منیش ئەمڕۆ کە (شەیدا)ی حوسن و شێوەی ئەو پەریزادەم
چ باکم قەتڵی دڵ! یا هیجری گوڵ، زۆرە وەیا کەمتر

***

# قەصیدەیەك بۆ شاری سلێمانیی [*]

هەولێر- ٢٠١٠/٣/٢١

دەستم بە چاکی دامەنت ئەی بادی نەوبەهار
ئەی پەیکی عاشقانی هەموو دێ و دەشت و شار
ئەمڕۆکە رۆژی تازەیی نەورۆزە، شاخ و کێو
رەنگاوە پاکی سەوزە هەموو قەددی دار و بار
بۆ جەمعی عاشقانی چەمەن، صوبحی صادیقە
بەو خەندە لەسەر لێوی گوڵ و بەرگی لالەزار
بەو تەرزی جوان و لەنجە و بەو راز و نازەوە
رۆژێکی خۆشە، هەستە بڕۆ بۆ هەواری یار
یەك لەحزە رامەوەستە لە رێگا دەخیلتم
نەك پەیکی کەس‌نەناسی ئەجەل بێت و بێتە خوار
تەقدیمی عەرزی من بکە وەختی گەیشتنت
بەو شارە دڵڕفێنە و جێ‌نەقشی کردگار
دەمدەم بە سۆز و نەغمەوە یادێکی من بکە
تا بێتەوە یادم زەمەنی کۆن و یادگار
بەو شاری عەشق و میهرە بڵێ عاشقێکی خۆت
تیفلێکی شیرەخۆرەیی تۆ، دوور و نادیار

---

[*] لەبەرئەوەی کە هەموو تەمەنی منداڵیم لە شاری (سلێمانیی) بەسەربرد و چەندین یادگاریی جوان و رەنگینم لەو گەڕەکە کۆنانەی ئەو شارە خۆشەویستە هەیە لەگەڵ دۆست و برادەرانم، لە هەمان کاتیشدا زەمەنێکە لێی دووركەوتوومەتەوە، بە ئەرکی سەرشانی خۆم و وەفای ئەزانم کە بەتایبەتیی (قەصیدە)یەکی بۆ بنووسم و پێشکەشی بکەم، چونکە ئەم شارە خۆشەویستە بۆتە بەشێکی گرنگ لە ژیانم و ئاوێتەی یەکتر بووین.

ئـەمڕۆ لـە شـاری پایەتـەختی قـەومی کـوردەوە
نامــەی بــە شــان و کـۆڵی منــا داوە، ئەشــکبار
تــا بــەم بەیانــە بیگەیــەنم مــن بــە بارەگــات
بەشکو ببێ کـە خـۆری ئەمـەل شـەوقی ئاشـکار
وەك پەیکی صوبحی حەزرەتی (نالیی) لە شـامەوە
بێ بـۆ حـوزووری (سـالم)ی غـەمدیـدە بـۆ هـەوار
لـەو شـاری عیشـقە، داخـی گـرانم کـە (سـالم)ێ
بــۆ مــن نــەماوە تــاکو بـدا جـوابی پرســیار
ئەم جۆرە تەبعی شیعرە کە وا ئێمـە فێـری بـووین
بـاوی نـەماوە لـەم دەمــە، کردوویـە کـۆچ و بـار
نەزمێکی باوی تر لـە ئـەدەب زاوە، کـرچ و کـاڵ
لـەم باخی شیعر و وێـژەیـە وا بـۆتـە دڕك و خـار
بــەزمێکی ســەیر و تازەیــە هاتۆتــە کایــەوە
ئەم جۆرە خـەوش و خاڵـە کـە کەوتۆتـە لا کـەنار
جێگەی لـە کـۆڕ و مـەجلیس و دیـوانی وێــژەیا
نابــێ، بــە داخ و دەردەوە! ناڕێــك و لــەنگ و لار
ئەو شـاری پـڕ لـە عیلمـە کـە وەك مۆزەخانەیـە
بۆ بەزمی شیعر و نەزمی ئـەدەب بۆتـە نـەونیگار
یـا بــۆ خــەڵاتی دیــدە، کتێبخانەیــێکە هــەر
هەم بۆ ڕەواجی سەنعەت و فـەن، پـڕ لـە ئاسـەوار
دیســان دەخیلــە دەسـتی مـن و چـاکی دامـەنت
هەسـتە بـە لار و لەنجـە بـڕۆ ئـەی نەسـیمی پـار
بۆ شـاری پایەتـەختی ئـەدەب، سـینە پـڕ هونـەر
یارانی دووری، دڵ بـە غـەمن پـڕ لـە ئـاه و نـار

یــانی وڵاتــی ســەردەمی (بابــان)ی هۆزەکــەم
بــاپیرە گــەورەکانی مــن و ئــەهلی شــوێنەوار
هەروەك رەئیسی تایفە بــوون، پــاکی یــەك بەیــەك
پشــت و پــەنایی بێنــەوا و میللــەتی هــەژار
ئــەهلی وەفــا و دۆســی قەڵــەم بــوون بــە راستیی
خــاوەن مــەقام و خــادیمی زانسـت و دەس بــەکار
هەرگا کە چوویتە باوەشــی ئــەو شــاری عیشــقەوە
یــەك یــەك بپرســە حــاڵی قــەدیمانی دۆس و یــار
ئینجــا بــە یــادی کۆنــەوە گەشــتێکی دڵ بکــە
ساتێ بە سووچی کووچــەیی (سەرچیمەن)ی دیـار
هــەروا لــە بــیری ســەردەمی تــافی منالّییــا
بــەزم و هــەرایی تیپــی منــاڵانی شــێت و هــار
مزگەوت و حوجرەخانەیی (شێخ بابە عەلی)یەکــەم
جارێ سەرێکی لــێ بــدە بــۆ کــەیف و دەفعــی زار
هــەروا مەوەســتە تــاکو نەگەیتــە (قــەزازەکان)
لــەولاوە جــادەیی (صــابونکەران)ی ئــەهلی کــار
دیســان بــڕۆ بــەدەم خــەیاڵی رێــوە بــۆ (ســەرا)
هەم جــادەیی (ئەســحابە ســپیی) بــبڕە بــێ قــەرار
ئینجا بە قەصــدی دیتنــی (مزگــەوتی گــەورە)وە
هەم یادی کۆنی مەدرەسەکەی حەوشی، وەك هەوار
ســاڵانی کــۆنی مــن لــە قوتابخانەکــەی لەگــەڵ
جەمعی کوڕانی، ســاڵی نــەوەد، کــوڕی خوێنــەوار
یا شوێنی (کاکــە ئەحمــەدی شــێخ) پــیری قــادریی
جێگەی فەقیر و حافظ و، مزگەوت و هــەم مــەزار

هەروا بە یادی دیمەنی (مزگەوتی حاجی حان)
بۆ مـن کـە بۆتـە مەرکـەزی زانسـت و یادگـار
دوایی بـڕۆرە حەوشـەیی (مزگـەوتی مەلکـەنیی)
بـەلکو نـەمامی عـومری عـەزیزم نـەبێ خەسـار
نابێ نەچیتە گولشـەنی (مزگـەوتی خانـەقا)
جێگـە و مـەقامی حـەزرەتی مـەولایی نامـدار
نەقاشی رەنگ و نەقشی طەریقەت لە خاکی کورد
بەو بوو کە جەمعی رۆڵەیی کورد بوون بـە تاجـدار
ئێستەش کە ئێمە هەر لەسەر ئەو نەهج و رێگەیەین
تـاکو سـەدایی پـەیکی ئەجـەل دێ بـەرەو خـوار
دیسـان بپێـوە جـادە و کـۆلانی (سەرشـەقام)
ئەمما دەروونی خاکی وەتـەن قـەت نەکـەی شـەقار
بازاڕی کۆن و پڕ لـە رەنگـی (حـەوزە وشـکەکە)
هەروا لە چینی سـادە و دەسـگێڕ و هـەم عـەتار
پاشان بڕۆرە قیسمەتی نـاو (قەیسـەریی نـەقیب)
مەڵبەندی چینی کاسب و توججـاری ئـەهلی شـار
هەرچـەندە ئێسـتە رۆشـنە، ئـەمما لـە کۆنـەوە
دووکان و بەینی رێگەیی، باریـك و تـەنگ و تـار
دیـوار و سـەقف و بـانی کـە سـووتا لەبیرمـە
ئەو دەم کە شەوقی نووری کەمی پاکی بوو بە نـار
هەروا شەقامی (مەولـەوی)یـو، (بەربەلەدیەکـە)
مەڵبەنـدی میوەهـاتی هـەموو وەرزی دەم بـەهار
پاشـان بـە شـانی جـادە و بـازاڕی (نـۆرزیی)
سووکێ بە لەنجە سەرکەوە بەو تـەرزی جـوان و لار

تاكو نەگەیتە جادەیی دڵگیری (تووی مەلیك)
ڕێگەی گەڕانی گەنج و هەموو چینی هەرزەكار
كاتێ ئەچووینە ئەم گەڕەك و دەوری جادەیە
جەمعی كوڕانی جادەگەڕ و پاسكیل سوار
پیاسە و گەڕانی ڕۆژ و شەوی (كانی ئاسكان)
تێیدا كە ماهی دیدە ئەبوو شەوقی ئاشكار
یا بۆ هەوایی پاك و شنە و شەوق و زەوقی دڵ
سارێژی زامی كۆمەڵی یارانی دەردەدار
وەك ئێمە داخی ناخی دەروونت بە با بدە
ساتێ بڕۆرە مەخزەنی گوڵ، باخی (سەرچنار)
چەن خۆشە بەزمی كۆنی منالّیی بخەیتەوە
یادم، لە گردی دڵكەشی (سەیوان)و (مامە یار)
وەرزی بەهار و ئاگری نەورۆزی دەشت و كێو
شاخ و چیایی (گۆیژە)و (ئەزمڕ)ی دیار
یاخود شەوانی خۆشی بەرات و بەراتیكە
یادی زەمان و دەوری منالّیی بە چەن هەزار
چاكم لەبیرە، لەو دەمە تیفلێكی سادە بووم
لاوێكی جوان و بێغەم و دڵخۆش و لێو بەبار
ئێستاكە داخ و دەردی گرانم، دەمێكە من
دوورم لە شاری یاری دڵ و لەیلی نازدار
تا هەم بە یادی دیمەنی، (شەیدا)م و عاشقم
دەستم بە چاكی بادی سەحەر، لەیل و هەم نەهار

* * *

## تامی ویصال

هەولێر- ۲۰۰۸/۲/۱۰

من وەها مەستم بە بادەی دەستی پیری مەیفرۆش
بۆیە بێباکم لە غەم بەم حاڵە ساغم یا نەخۆش
گەر وەفاکا لەم دەمە ساقیی لەگەڵ ئەهلی غەما
کۆڕی عەشق و بەزمی ئەهلی دڵ بەجارێ دێتە جۆش
من نیازم وایە ئەمڕۆ بچمە خزمەت یاری خۆم
مەرحەمەت کە بەستەیێ قوربانتم ئەی گوڵفرۆش
سا دەخیلت بم وەرە ساقیی بە هاواری دڵم
تووخودا رەحمێ بە حاڵی من بکەی ئەمجارە تۆش
تیفلی بەستەزمانی دڵ، هەوری جەفا بوو دایەنی
هەر بە شیری غەم کرا رۆژی لەدایکبوونی، گۆش
من کە بێبەش بم لە رەنگی گوڵ بە وێنەی عەندەلیب
سا ئەبێ چی بێ گوناهم گەر نەمێنێ عەقڵ و هۆش
تا بەکەی هەر ماتو، بەرگی غەم لەبەرکەم رۆژ و شەو
بێکەس و داماو و بێدەر، دەربەدەر وەك کۆنەپۆش
خۆ منیش هەقمە لە دنیادا وەکو یارانی تر
بۆ جەمێکیش بێ بکەم تامی ویصال و عەیش و نۆش
عالەمێ گیرۆدەیی داوی بەڵاتە، دیدەکەم
با نەبێ بازاڕی عەشقت هەرگیزا مات و خەمۆش
دەی ئەگەر ئەمرۆکە تۆ رەحمێ بە حاڵی دڵ نەکەی
کەی ئەبی بۆ حاڵی زاری عاشقی (شەیدا)، پەرۆش

***

## قووتی غەم[*]

هەولێر- ٢٠٠٢/٢/١

عـــەزیزم دیدەکـــەم، مـــاڵی دەروون وێرانـــە بـــۆ عاشـــق
جیهـــانی بـــێ مەحەببـــەت، کولبـــەیی ئەحزانـــە بـــۆ عاشـــق
ئەگـــەر ســـەیرێکی حـــاڵی ئـــەهلی ئـــەم دنیایەکـــەی جانـــا
ئەبینی عەیش و نۆشی بـێ مـەزەی دڵ، ژانـە بـۆ عاشـق
ئەگـــەر دەســـتی رەقیبـــی بـــێ مـــرووەت لێـــی نەشـــێوێنێ
بە شەوقی مەیلی لەیلا، کونجی غەم سـەیرانە بـۆ عاشـق
لە گۆشەی مەدرەسەی عەشـقی حـەقیقیی یـا مەجازیـدا
فیـــداکردن بـــە مـــاڵ و رۆح و ســـەر، ئاســـانە بـــۆ عاشـــق
لە دووری رەنگی گوڵ هەم دەوری شوعلەی شەمعە شایانە
بەتـــەنها هـــەر مـــەقامی بولبـــول و پەروانـــە بـــۆ عاشـــق
بە عیشوە و نازی دڵبەر، وەسڵی گوڵ گەر رێکەوێ خۆشـە
بە دەستی ئەو، شەهادەت خەرمەنی ئیحسانە بـۆ عاشـق
ســـەر و مـــاڵی فیـــداکا بـــۆ ویصالـــی یـــار و لەیلاکـــەی
بە شەرتێ ئەم قبووڵی‌کا، بـە حـەق هەرزانـە بـۆ عاشـق
هـــەتا رۆژی قیامـــەت عـــادەتی ئـــەم بەزمـــە هـــەر وایـــە
لە رێگەی عەشـقی دڵ، فـەوتان و سـەردانانە بـۆ عاشـق
خەیاڵی خاوە (شەیدا) گەر تەمای خۆشـیی لـە دڵـدا بـێ
ئەزانێ چونکە قووتی غـەم لـە جێگـەی نانـە بـۆ عاشـق

٭٭٭

---

[*] ئەم هۆنراوەیەم بۆ هاورێی خۆشەویستم: کاک (عەدنان سەیرانیی) لە سلێمانیی نووسی.

## کەرکووک [*]

هەولێر- ٢٠٠٨/١/١

ئەسەف ئەمڕۆکە ساڵێ پڕ غەمی لێ رابرا کەرکووک

کە وادەی چارەنووسی نادیاری دواخرا کەرکووک

هەموو کورد چاوەڕێ بوو سەردەمێ بێت و بڵێن ئەمڕۆ

(سەد و چل) مۆمی (دەسکردی گەل)ی لێ هەڵکرا کەرکووک

کەچی تازە بەتازە ئەچنەوە سەر ئەلفوبێی ئەووڵ

ئەمێستا وەك هەتیو بێنازە، بێ باب و برا کەرکووک

دەمێکە هەولی فەوتانی لەئارادایە ئەم خاکە

کە چەن وادەی درۆ و قەول و بەڵێنی پێدرا کەرکووک

ئەوا ئەمڕۆ بە پیلانی گەلانی دژ بە مافی کورد

بە تیری دەستی دوژمن جەرگ و سینەی کون کرا کەرکووک

بە فێڵی دوژمنانی قەومی کورد و خاکی، ئەمجارەش

عەجایب زوڵم و غەدرێکی بەناهەق لێکرا کەرکووک

لە دڵ سافیی گەل و، کینەی دڵ و سینەی رەقیبی گەل

بەبێ ئاگا پەتی سێدارەیی بۆ هەڵخرا کەرکووک

دەمێکە خوێنی لێ ئەرژێت و لاشەی زار و زامارە

دەسا هاکا کە وتیان خەستە بوو هەڵواسرا کەرکووک

بەڵام حەیف و خەسارە، چاوی ئەم حاڵە ببینێ گەل

بڵێن وا گیانی شیرین و سەری لێ سەندرا کەرکووک

---

[*] ئەم هۆنراوەیە لە سایتی (کوردستان نێت) رۆژی ٢٠٠٨/١/٢٢ لەژێر ناونیشانی (چارەنووسی کەرکووك و ماددەی سەدوچل) بلاوکراوەتەوە.

مەگەر رۆڵەی بەجەرگ و گیان لەسەردەستی نەمابێ کورد
ئەنا هەرگیز مەحاڵە دژ بڵێ مافی خورا کەرکووك
ئەبێ هەردەم بەگوڕ بێ بابەگوڕگوڕ، گڕ لەخۆگرتوو
بسووتێنێ رەقیبانی لە کڵپەی ئاگرا کەرکووك
سەراسەر خاکی کوردستانەکەم ماڵێکی خامۆشە
بە خەم گیراوە رۆژ و شەو ولات و، وەك چرا کەرکووك
ئومێدێ ماوە، نیوەی ئەووەڵی ئەمساڵە ئێمەی کورد
بە ئازادیی کە بیبینین لە بەرگێکی ترا کەرکووك
بەبێ کەرکووکی بووکی خێرنەدیوی خاکی کوردستان
مەحاڵە سەرکەوێ گەل تا نەڵێن وا سەرخرا کەرکووك
لە ئەووەڵ رۆژی دنیا و لەدایکبوونی ئەم خاکە
بە هەویە و ناسنامەی میللەتی کورد ناسرا کەرکووك
بەڵێ (شەیدا)یەکی عاشق بە ئەم خاك و ولاتەم من
کە ئەمڕۆ بۆتە مەیدانی خەبات و چوارچرا کەرکووك

***

# فەسڵی خەزان

هەولێر- ١٩٩٩/١٠/٢٥

وا دیسان فەسڵی خەزان و شیوەنە بۆ زاری دڵ
وەرزی بارانی غەمە بۆ وەزعی ناهەمواری دڵ
دەشتی لاشەم پاکی خاری لێ رواوە داخەکەم
من کە شك نابەم حەکیمێ تا بکا تیماری دڵ
هەر لە بەختی خۆمە وا کەوتوومە بەردەستی رەقیب
زۆری دا بەم داخ و دەردە، ئەزیەت و ئازاری دڵ
شەوقی ماهی دولبەرێ، خستمیە داوی عەشقەوە
بۆیە ئاوا بێکەس و وێرانە ئەمڕۆ شاری دڵ
گەر بەیانی حاڵی دڵکەم من لەخزمەت یاری خۆم
گەر مەدەدکا رەنگە لابا ئافەتی شەوگاری دڵ
تیری غەم بوو صەیدی پێکا، هەڵوەریی گوڵ بۆیە وا
تێکشکاو و پارە و لەت لەت بووە شاکاری دڵ
نوقمی هاژە و گێژەڵووکەی بای خەزانە لاشەکەم
سەربەسەر پاکی رماوە، شەق بووە دیواری دڵ
بولبولی دڵ توشنەیی ئاوی حەیاتە رۆژ و شەو
چونکە دایم بۆتە قووتی (لاَیَمُوت)ی، خاری دڵ
سا منی (شەیدا) بە کۆڵێ راز و نازی عەشقەوە
لای چ لەیلێ هەڵبڕێژم میحنەت و ئەسراری دڵ

***

# بۆ جوانیی شاری سلێمانیی

سلێمانیی- ٢٨/٨/٢٠٠٢

چ خۆش و دڵکەشە ئەم شـارە ئـەی دڵ
ببینــە چــەندە پــڕ گوڵــزارە ئــەی دڵ
بەشی تــۆ گەرچــی خــەرمانی خەمانــە
هەتا سەر خۆ نیـە ئـەم بـارە ئـەی دڵ
ئەمێســتاکە وەهــا دڵخــۆش و شــادی
بــە چەشــنی بولبــولی ئـاوارە ئــەی دڵ
لە وەختێکا بەخزمەت گـوڵ بگـا ئـەو
ئــیتر وادەی نــەمانی خــارە ئــەی دڵ
ئەتۆش ئـاواتی عــومرت وەسـڵی یـارە
ئەمیش خۆ شاری لەیل و یارە ئـەی دڵ
ئەگەرچــی مــاهی حوســنی نادیــارە
بەڵام شێوەی لـە دڵـدا دیـارە ئـەی دڵ
نیشــانەی دولبــەری وا پێوەیــە شــار
سـەراسەر مەخـزەنی ئەسـرارە ئـەی دڵ
بڵێــی ڕۆژێ دڵــەی (شــەیدا) نــەمێنێ
خـەم و ناسـۆری لـەو دڵـدارە ئـەی دڵ

* * *

# مەوجی ئەشك

هەولێر- ٢٠٠٣/١٠/١٧

ئەبێ کەی بێتەدی یاڕەب ویصالی گوڵ، بەهاری دڵ

ببێتە زەمزەمە و جۆش و خرۆش و شۆری شاری دڵ

وتم ئەی دڵ دەبا ئەحواڵی عەشقت بشنەون یاران

وتی ئاخر ئەترسم من لە لۆمەی غەیر و یاری دڵ

سەراسەر هەوری بێنامانی بەختم سەرمی پۆشیوە

بەدەم خوێناوی ئەشکم مەوج ئەدا ئەمڕۆ کەناری دڵ

هەتا کەی بەرهەمی عومری عەزیزم بێسەمەر بێ من

لەبەرچی بێئەمەل بم من لە ئەو راو و شکاری دڵ

لە سووچی خەستەخانەی عەشقی، ئەو لەیلی وەفادارم

بکا لوتفێ، نیگاهێکی شیفایە بۆ گوشاری دڵ

دەبا مەیلێ لەگەڵ ئەم عاشقی دێوانە بنوێنێ

کە تا سەر شەوق و شادیی بێ ئیتر لەیل و نەهاری دڵ

هەتا دولبەر نەکا رەحمێ بە حاڵی ئەم دڵەی (شەیدا)

مەحاڵە بسرەوێ تاوێ لە مەوجی غەم، بیحاری دڵ

❊❊❊

# هەمدەمی گڵ

هەولێر- ٢٠٠٤/٢/١٤

فیدای خـاکی چـەمەن بم چـونکە وا بۆتـە قـەرینی گـوڵ
دڵـەی بـەردم ببێتـە هەمـدەمی گـڵ بـۆ سـەرینی گـوڵ
بـە دوو دیـدە و گلێنـەی چـاوەکانم شـەم ئەپارێـزم
بە گیـان و رۆحـی شیرینم ئەکـەم پـەرژینی ژینـی گـوڵ
لە باسـی شۆڕشـی پـڕ جۆشـی لـەیلادا سـەبا فـەرمووی
ئەگـەر ئـەمڕۆ نیـازت وایـە تـۆ سـاتێ ببینـی گـوڵ
ئـەبێ دایـم ببیتـە هەمـدەمی بولبـول، وەگـەرنا خـۆ
بە ئاسـانیی بەدەسـتت ناکـەوێ عـەشـق و ئـەوینی گـوڵ
بەڵێ وەختێ ئەگاتە وەسڵی مەعشووقی دڵـی، هەرکـەس
کە لەم بتخانە دەرچـێ، بێتـە سـەر رێبـاز و دینـی گـوڵ
لـە ئەسـراری محەببـەت، بـێ دڵانـی سـادە تێناگـەن
لـە گوڵشـەن عیللـەتی نادانییـە هەڵسـانی قینـی گـوڵ
بەجارێ تێك ئەچـێ چـەرخی فەلـەك، عالـەم ئەشـێوێنێ
شکانی رەونـەقی روی مـەهـ میسـال و ئەختـەرینی گـوڵ
خرۆشـا بـەزمی گوڵشـەن، گوڵعـوزاران کەوتنـە شـیوەن
بـە دەنگـی دڵتـەزێن و نەغمـە و ناڵـەی حـەزینی گـوڵ
دەسا چی‌بکەم لەدەس بێـدادی‌یـو جـەوری رەقیبـی غـەم
کـە بـەم ناوەختـە ئەکولێنێتـەوە زام و برینـی گـوڵ
هـەتا وادەی حـەیات و ژینـی دڵ مـاوە لـە دنیـادا
ئیلاهـی تێـك ئەچـێ روخسـار و شـێوەی نازەنینی گـوڵ

لــه ســاحەی گیانفیــدایی دڵبــەرا، دڵ ئــارەزووی وایــە
کــە عــومری قــەت نەگاتــە پــایز و وەرزی وەرینــی گــوڵ
شوکور وا بوو بــەهۆی چــارە و شــیفای زامــی دڵــەی زارم
بەدەم ئــاواز و نەغمــەی ســازی ســینەم، پێکــەنینی گــوڵ
منی (شــەیدا) تــەمادارم لــە گۆشــەی گوڵشــەنی حوســنا
نسیبی ئەم دڵــەی بولبــول ســیفەت بــێ، ئافــەرینی گــوڵ

***

## عالەمی دڵ

هەولێر- ٢٠٠٥/٤/٢٥

عەجەب بەزمێکە یاران عالـەمی دڵ

دەبێ بـارانی رەحمـەت لێیـوە نـازڵ

لە ڕێی ئوستادی مەکتەبخانەکەی عەشق

لەخزمـەت مورشـیدێکی پیری کـامڵ

ژیـانی بـێ محەببـەت ژانـە بـۆ دڵ

لەلای مەردی ڕەشـید و ڕەنـد و عـاقڵ

ئەوەنـدە بـا نـەبێ گـوڵ لـەم زەمانـە

لـە حـاڵی بولبـولی دێوانـە غـافڵ

دەبا بۆ شەوق و زەوقی ئەهلی مەجلیس

بڵـێن تەشـریفی تـاوێ بێتـە مـەنزڵ

لـەبۆ دەردی دڵـی دامـاوی عالـەم

بکا چارێ کـە نـووری حـەق بـدا قـوڵ

لە سـینەی کـۆڕی ڕەنـدانی حەقیقـەت

بە جۆرێ بێتـە جـۆش و قرچـە و کـوڵ

بـەڵێ بولبـول بـە ئاسـانیی لـە باخـا

بـەبێ دڕکـی جـەفا ناگاتـە سـەر چـڵ

بە بێباکیی لە ڕێی عەشقا بە شـادیی

ئەبێ دانێ سـەری بـۆ ئـارەزووی گـوڵ

بە ئومێدم منیش لەو لەیلی گـوڵڕەنگ

لە عەشقی ئەم دڵەی (شەیدا) نەکا سڵ

***

# شووشەی شکاو

هەولێر- ٢٠٠٩/٣/١٨

لـــە ئـــاهـ و حەســـرەت و گـــڕی مەحەببـــەتا كـــوڵاوە دڵ

لە دەرد و میحنەت و غـــەمی گـــوڵا دەمـــێ ژیـــاوە دڵ

بە سەیری تێمەگەن كە دڵ نـــەماوە مـــەیل و ئولفـــەتی

فیراقـــی یـــاری دڵبـــەرە كـــە رەونـــەقی نـــەماوە دڵ

ئومێد و شەوقی دڵ ئـــەبێ چ بـــێ لـــە یـــاری بـــێ وەفـــا

لە صەحنی نێو حەرەمسەرایی گـــوڵ كـــە دەركـــراوە دڵ

بە باری میحنەت و جەفا قبووڵی عەیش و نۆشی غەم

لە بـاخی عەشـقی گـوڵ كـەمێ نسـیبی پێـدراوە دڵ

هەتا ویصال و مەیلی گوڵ لەنێو چەمەن نەیـێـتـەدیی

مەحاڵـــە چـــابیێتەوە، كـــە شووشـــەیێ شـــكاوە دڵ

(شەیدا)ی جەماڵی دڵبەرم هەتاكو ماوە عـــومری مـــن

بـــە تـــیری دەســـت و پەنجـــەیی وەهـــا كـــە پێكـــراوە دڵ

***

# وەرزی گوڵزار

هەولێر- ٢٠٠٩/٥/١

موژدەبێ ئەی دیدە ئەمڕۆ مەستی بێئازارە دڵ
وەرزی گوڵزاری بەهار و گوڵشەنی بێخارە دڵ
میحنەتی دڵ وا بەسەرچوو، رونیەتی گوڵ هاتەوە
هەر تەماداری نەسیمی مەیل و لوتفی یارە دڵ
هەر لەبۆ عاشق لە مەکتەبخانەکەی نوستادی عەشق
مەخزەنی راز و نیاز و مەحرەمی ئەسرارە دڵ
بولبولی دڵ مەیلی نێو باخ و گوڵستانی هەیە
شەوقی سەیرانی بەهار و دیمەنی گوڵزارە دڵ
من نەمردم وا دیسان چاوم بە گوڵشەن کەوتەوە
لەم ژیانە گەر ویصالی گوڵ نەبێ، بێزارە دڵ
عاشقی (شەیدا) بەئومێدی نیگاهی دولبەرە
تا بمێنێ، مەیلی لەیل و تەرکی گشت ئەغیارە دڵ

***

# دڵ و گوڵ

هەولێر- ٢٠٠٩/٥/٢٤

سەیری بەزمی دڵ بکەن یاران کە لەیل و یارە گوڵ
هەمدەمی راز و نیازی عاشقی بێدارە گوڵ
ئەو بە خوێنی ئەهلی دڵ ئاوی دراوە، رەنگی سوور
لەب شەکەر، تیری جگەر، مەعشووقەیی خونخوارە گوڵ
بولعەجەب بەزمێکی سەیرە سیڕڕی گەنج و رەمزی عەشق
فیتنەگەر بۆ حاڵی سەد مەجنوونی دڵ ئەفگارە گوڵ
خاری گوڵشەن ئەزیەت و ئازاری بۆ کەس خۆ نیە
لەم جیهانی عەشقەدا جێداری دڕك و خارە گوڵ
عالەمێ شێواوی حوسن و خیلقەتی ئەو دیمەنەن
یەك بەیەك ئاشفتەحاڵی عەشقن و سەردارە گوڵ
من هەتا ئێستاکە نەمدیوە عەجایبتر لەمە
هەم شیفا بۆ زامی دڵ گوڵ، هەم جەفاکردارە گوڵ
لەم گوڵستانی وەفا و پڕ صەفایی حوسنەدا
دڵ نیگاری رەمزی عەشقە و مەخزەنی ئەسرارە گوڵ
سالیکی رێ بۆ بڕینی مەرحەلەی رێبازی عەشق
رۆح و گیان و دڵ ئەبەخشێ، مەستی بێئازارە گوڵ
عالەمێ سەرقاڵی باسی باخ و گوڵزاری گوڵن
شایەنی وەسف و مەدیح و گوڵشەنی ئەشعارە گوڵ
عاشقی (شەیدا) وەکو بولبول ئەناڵێ رۆژ و شەو
لەم جیهانی عەشقەدا بێباك و کەم گوفتارە گوڵ

***

# لە سایەی دڵبەردا[*]

هەولێر- ١٩٩٨/٦/١١

کــە مــن مــەفتوونی چــاوی پــڕ لــە نــازم
لەســــایەی تــــۆوە (خــــاوەن ئیمتیــــاز)م
ئەگەرچــی وەك پەپوولــەی بــەر چــرا بم
لــەژێر بــاڵی هومــادا صــەقر و بــازم
کــە مــن دیلــم بــە داوی خــاڵی هینــدووت
وەکــو قەقنــەس ئەســووتێم و ئەســازم
فــەقیرم وەك ئەســیرم دوور لــە چــاوت
بــە غــەمزەی چــاوەکانی تــۆ ئــەنازم
کە عەشقت ئاگرە و لاشەی منــیش پــووش
خــەریکی مامەڵــەی بەنــزین و غــازم
لــە موڵــکی بێکەســیدا بــێ پــەنا خــۆم
ئەســیری ئــێش و ئــازار و گــودازم
چ موژدێکــە منــیش وەك قەیســی عــامیر
بڵــێم مــەجنوونی لەیلاکــەی حیجــازم
رەقیــب بــا وانــەزانێ تــۆم نــەماوە
عــەلا رەغمــی عــەدوو هــەر ســەرفرازم
کــە ئــەمڕۆ غــەمڕەوێنی دڵ نــەماوە
منــیش هــەر بۆیــە نــاکۆك و نەســازم
بــەڵام بــەم حاڵــەوەش (شــەیدا) بــە یــادت
هەمیشــە ســینە گــەنجی دەرکــی رازم

---

[*] مەرحوومی باوکم ئەم هۆنراوەیەی بە زمانی منەوە نووسی بەهۆی بوونم بە خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری پەیڕەو.

## حەیرانی شار

سلێمانیی- ١٩٩٩/٣/١٠

بزانە ئـەی دڵـەی دێوانـە مـن حـەیرانی ئـەم شـارەم
بە دایم ئاردزوومەندی سـەفا و سـەیرانی ئـەم شـارەم
منی چەند ساڵە تیفلی شیرەخۆرەی پاکی ئـەم خاکـەم
وەهـا بۆیـە خـەریکی شـیوەن و گریـانی ئـەم شـارەم
بـە یـادی سـەردەمی بـەزمی منـاڵیم و گڕوگـاڵم
ئەمێستا روو لە باخی دڵفریـب و جـوانی ئـەم شـارەم
ئەسیری عەشقی لەیلێکم کە ئەو بێڕەحم و مەیلێکـە
لـە یـادی یادگـاریی دڵکەشـی جـارانی ئـەم شـارەم
ئەگەرچی من غولامی دەرکی گەنجینەی غـەمم، ئـەمما
لە رێگەی عەشقی گوڵ سەرقافڵەی کاروانی ئەم شارەم
لـە کۆچـی دوا هەناسـەی مەرگـدا ئـاواتی دڵ وایـە
سپەردەی خاکی پاکی گردەکەی سـەیوانی ئـەم شـارەم
لە وەختێکا کە مـن پـێم ناوەتـە بـازاڕی بـەزمی دڵ
قوتابیی مەدرەسەی عەشقم، لە (شەیدا)یانی ئەم شارەم

***

# چاری دەردی دڵ[*]

هەولێر- ١٩٩٩/٦/٤

چاری دەردی دڵ حەواڵەی دەستی دڵشادێ دەکەم
تاهی خۆم تەقدیمی جەلسەی مەرد و شازادێ دەکەم
ناعیلاجم روو لە رێگەی خاوەن ئیرشادێ دەکەم
(بیبیێ یا نەیبیێ، مەن داد و بێدادێ دەکەم
گوێ بداتێ یا نەداتێ ئاه و فەریادێ دەکەم)

بۆنەوەی بگرێ دەسم دائیم لە لاڕێ (بِالخُصُوص)
چونکە شەیتان و نەفس هاتوونە رێگەم وەك لصووص
من ئەگەر یارم نەبێ هەرگیز بە دڵ نابم خەلووص
(حەققی ئیخلاصە بەجێهێنانی نادابی خولووص
پێ بزانێ یا نەزانێ، مەن بە دڵ یادێ دەکەم)

ئێستە وا کەوتوومە نێو گێژاوی جەنگ و کێشەکێش
مەن بەتەنهام و ژمارەی دوژمنم زۆر و لەپێش
نەفسی بەدکارم بە زۆریی پێم نەدا نازار و ئێش
(بێستوونی عیشقی شیرینێك نەوا هاتۆتە پێش
گەر لە حەق بێم و نەیەم تەقلیدی فەرهادێ دەکەم)

---

[*] ئەم هۆنراوەیەم بە شێوەی پێنج خشتەکیی لەسەر پارچە شیعرێکی (مەحوی) نووسی، کە لە ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری (پەیڕەو) ساڵی ٢٠٠٠ بڵاوکراوەتەوە.

شـیر و تـیری بۆچـی‌یـە یـارم ئەگـەر گـەردن نـەبێ
ئیختیـاری چـی ئـەکا بـۆ عاشـقی، کوشـتن نـەبێ
گـەردنم وا خسـتە بـەرپێی تـا لـە دەسـتی ون نـەبێ
(ئاوی تێغی وەقفی هـەر توشـنە لەبێکـە مـن نـەبێ
کارگەر بێ یـا نـەبێ لـەم مـەظلـەمـە دادێ دەکـەم)

زۆر دەمێکــە مــن ئــەبینم مــاڵی دڵ کــاول بــووە
تیغــی ئیمــانم بـەجارێ خـاو و خەسـتە و کـول بـووە
جازیبەی نەفسم بەهێـزە، دەسـت و قاچـم شـل بـووە
(دەرسی عیشقم هەر لەکن پەروانـە یـا بولبـول بـووە
بیگەمێ یا نەیگەمێ هەر مەشقی ئوسـتادێ دەکـەم)

من بەدەس شەیطـان و نەفسم کەوتمە بەندی داو و گـیر
شەش دەرم گـیرا بـەجارێ زۆر عـەجیب و بـێ‌نـەظـیر
لێـرەدا بێهوودەیــە هێــزی مــەتاڵ و شــیر و تــیر
(کوشتنی ئیسفەندیاری نەفســە بەسـتەی رایـی پـیر
گەر مەدەدکا یا نـەکا لـەو شـاهە ئیمـدادێ دەکـەم)

من لە عومرم کردەوەی چاکم نـەبوو غـەیری قصـوور
ئەم ژیانـەم وا بـەرێ‌کـرد سـەرکەش و دڵ پـڕ غـروور
جەستەکەت حازرکە (شەیدا) بۆ گەزندەی مار و مـوور
(بەم نـزیکانە لەبەرمـە (مـەحوی)یـا رێگێکـی دوور
بێتە دەسـتم یـا نـەیێ هـەر کۆششـی زادێ دەکـەم)

***

# دڵتەنگیی

هەولێر- ٨/٥/٢٠٠٠

عـــەزیزم بۆچـی مـن دایـم حـەزین و دڵ نەخۆشـت بم
زەلیلـی دەسـتی جـەللاد و رەقیبـی خۆفرۆشـت بم
لـە حـاڵی پەسـت و وێـرانم بپرسـە بـۆ وەفـا جـارێ
نـەزانم چـونکە تـا مـاوم ئـەبێ زار و پەرۆشـت بم
بەتەنها من لە بازاڕی گوڵت مەحرووم و بێبـەش بـووم
وەکو بولبول دەسـا بـا تێکـەڵی جـۆش و خرۆشـت بم
ئەگەر رێم کەوتە نێو باخ و چەمەن، رەحمێ بە حاڵم کە
هەتا کەی هـەر منـی دێوانـە شـێواو و خەمۆشـت بم
لـە مەیخانـەی غـەمی دایـم سـەراپا ئـاوەدانی تـۆ
منی دڵ کەیلی میهرت، چی ئەقـەومێ بادەنۆشـت بم
لە ریزی کۆمەڵی عوشاقی حوسنت با منیش رێگـەم
ببێ (شەیدا)ی جەماڵی بێ میسـاڵ و، کۆنەپۆشـت بم

***

## هەراسانیی

هەولێر- ٢٠٠٠/٧/١٥

دەمێکــە بێخەبــەر مــاوم لــە ئــەوزاعی گــوڵ و یــارم
لـــە حـــاڵی خـــۆم هەراســـانم، بـــە دەردی دڵ گرفتـــارم
ئەمێســتا مــن کــە گــیرۆدەی غــەمم، شــێواوە حــاڵی دڵ
لە دەشتی بێکەسیی کەوتووم و وەك گەستەی دەمی مارم
نــەمانم چــاترە لــەم مانــە گــەر دەســتی قــەزا بیکــا
کــە دەرچــێ رۆحــی شــیرینم لــە لاشــەی زەرد و بیمــارم
وەکو مەجنوونی بێکەس، دەربەدەر کوشتەی غەمی لەیلا
بــە تــیری دەســتی دولبــەر کــەوتووم ئێســتا برینــدارم
بە بێهۆ دەربەدەر بووم، کەس نەبێ یارەب بە حـاڵی مـن
لە ساحەی غوربەتا کـەوتووم و کـەس نایـەت بـە هـاوارم
عەجەب یارێکی بێرەحم و وەفا بـوو گـوڵ لەگـەڵ منـدا
نــەبوو جــارێ بکــا رەحمــێ بــە نالــە و ئــێش و ئــازارم
کە من (شەیدا)ی جەماڵی یارم و بـێمیهـرە ئـەو، ئـەمما
بــە مــوژدەی وەســڵی روخســاری، هــەتا مــاوم تــەماکارم

***

# بەختی کڵۆڵ

هەولێر ١٧-١٨/١٠/٢٠٠٠

کڵۆڵە بەختەکەم، خۆشم کڵۆڵم ‌‌‌‌ ‌ ‌ ‌ لە بەزمی بادە دەنگ نادا دەهۆڵم

بە ڕۆژ و شەو هەموو گریانە کارم ‌ ‌ ‌ نەماوە هێزی سەدبەندیی مژۆڵم

بەڵێ بێ‌هەمدەمم من بۆیە دایم ‌ ‌ ‌ گەڕیدە و وێڵی دەشت و هەرد و چۆڵم

وەکو دێوانە ڕێگەی عەشقە ڕێگەم ‌ ‌ ‌ بە مەشقی عەشقەوە کەشکۆڵ لەکۆڵم

ئەوا عومرێکە وەك مەجنوونی بێکەس ‌ ‌ ‌ بەشوێن لەیلا سیفاتێکا گەڕۆڵم

لە ساحەی نائومێدیی مەیلی یارم ‌ ‌ ‌ لە پێ کەوتووم، شکاوە دەست و قۆڵم

لە جێگەی بەزمی مەیخانەی محەببەت ‌ ‌ ‌ موقیمی کونجی غەم یا شیو و دۆڵم

ببینن لاشەکەی لەت لەت کراوم ‌ ‌ ‌ کە وا تێکەڵ بە خوێن و خاك و خۆڵم

بە ئەشکی گەرمی دیدەم دائەمرکێ ‌ ‌ ‌ سەهۆڵبەندانی لاشەی وەك سەهۆڵم

نیازم وایە وەك فەرهادی کۆکەن ‌ ‌ ‌ بە هەردا دەم کەچیی داماو و کۆڵم

لە سووچیماڵی غەمباریی بەتەنها ‌ ‌ ‌ فەقیر و بێ‌بەها لات و کزۆڵم

ئەڵێ (شەیدا) ئەبێ خێرۆمەنێ بێ ‌ ‌ ‌ بکا ڕەحمێ بە ئەم حاڵی شڕۆڵم

❊❊❊

# نەغمەخوانیی

هەولێر- ٢٠٠١/٥/٢٦

وتم ئـەی دولبـەری مـن، بۆچـی ناپرسـی لـە ئـەحواڵم!
مەگـەر تـۆ سـەرد و بـێ‌میهـری وەیـاخۆ مـن سیاسـاڵم
نـەبینم سەربەسـەر یـارانی مەیخانـە دڵ ئاسـوودەن
کەچـیی رەشپۆشـە ئـەمڕۆ ئاسمـانی سـاف و سـاماڵم
لەنێو بەزمی مەحەببەتـدا هـەموو سـەرخۆش و سەرمەسـتن
بەتەنها هـەر مـنم وێـڵ و سـەرئەفگەندە و کـەڕ و لاڵـم
بە سۆزی عەشـقی تـۆوە بولبـولێکی نەغمـەخوانت بـووم
کەچـیی ئێسـتاکە گـیراوە سـتارەی سـەعدی ئیقبـاڵم
ئیشـارەی چـاوەکەی مەسـتت نیشـانەی شـیددەتی قینـە
مەفـەرموو نـازە لاریـی دوو بـرۆم و چـاوەکەی کـاڵم
شەهیدی دەستی تـۆم و دڵ فیـدای گیـان و سـەری خـۆتم
گـەواهی صـیدقی دەعوامـە لیبـاس و پەنجەکـەی ئـاڵم
ئەڵێن مـەجنوون بـە دەردی عەشـقەوە رۆیـی لـە دنیـادا
منـی دێوانـە گـیرۆدەی دو زولـف و خەرمـەنی خـاڵم
لە باخی بێ‌بـەری عـومری سەراسـەر شـین و زاریـی مـن
ئـەتۆ بـووی مایـەیی دەردی دڵ و پـەژموردەیی حـاڵم
وتم توخـوا دەخیلـت بم هـەتا کـەی عیشـوە ئەفرۆشـی
وتـت نـا وامەزانـە، دولبـەرێکی خـۆش خـەت و خـاڵم
دەسا گەر خۆش خەت و خاڵیی وەها بێ، دولبـەرا شـەرتە
لە رێگەی عەشقی دڵدا هەر فیدای تـۆ بـێ سـەر و مـاڵم
دڵەی (شـەیدا) بە رۆژ و شەو تـەناڵێنێ لـە شـەوقی گـوڵ
ئـەڵێ ئۆخـەی وەکـو بولبـول، شـوکور بێهـوودە نانـاڵم

## مات و بێنەوا

هەولێر- ٢٠٠١/٩/١٤

ئەی دڵ ئـەتۆ فـەقیر و مـن مـات و بێنـەوا خـۆم
تۆ هەمدەمی غەم و من مەلوول و موبتـەلا خـۆم
لە خەسـتەخانەیی دڵ، بـێ‌مەرهـەم و شـیفا خـۆم
مەحروومی بادە تۆی و من بێکـەس و گـەدا خـۆم
لـەنێو حەرەمسـەرادا بـێ‌نـرخ و بـێ‌بـەها خـۆم

مەجنوونی دەشت و دەر بووم عالەم بە شێتی زانیم
نەمـدی بـە غـەیری لـەیلا کەسـێکی تـر روانـیم
لـــە رێ بــڕین قصــوورم نــەکرد هــەتا تــوانیم
بە بێ‌سەمەر بەسەرچوو نەمامی عـومری جـوانیم
لـە دەشـتی پـڕ بـەڵادا شـەهیدی کەربـەلا خـۆم

مـن باخـەوانی بـاخی گوڵـزار و گوڵشـەنێ بـووم
بە مەیلی دڵ بە دایـم مـوقیمی مەسـکەنێ بـووم
لە شەوقی عەشقی شیرین، فەرهادی کۆکەنێ بـووم
رەفیق و هەمدەمی نەی، حـەریفی نەیـژەنێ بـووم
ئێستاکە بێ‌تـەنیس و بێـدەنگ و بـێ‌سـەدا خـۆم

سـەرمایەیی ژیـانم دولبـەر بـو غـارەتی کـرد
خالّیی لە غەم بو تێکەڵ بە دەرد و مەینەتی کـرد
دڵێکی کون کونم بـوو، وێـران و لـەت لـەتی کـرد
بە بێ‌دەلیل و مەتڵەب، بێ‌شان و شـەوکەتی کـرد
بـێ‌هەمـدەم و حـەبیب و بـێ‌یـار و ئاشـنا خـۆم

لە باخی حوسنی عەشقا، تەیرێکی بێ زەرەر بووم
بە دایم نینتیزاری شنەی دەمی سەحەر بووم
هەمرەنگی بولبولی گوڵ بێ ئیسم و بێ نەسەر بووم
بە فەوتی پیری ساقیی، بێ باب و بێ پەدەر بووم
کوژراوی تیری دەستی صەیادی بێ وەفا خۆم

یاران دەخیلە توخوا رەحمێ بکەن بە حاڵم
شێواوە هەست و هۆشم، شپرزەیە خەیاڵم
بە ژان و ئێشی زامم، شەو تا سەحەر ئەناڵم
موحتاجی دەستی یار و شنەی دەمی شەماڵم
قوربانی موژدەبەخشێ، سەوداسەری سەبا خۆم

سەد شوکری بێ نیهایەت، بێ باکە دڵ لە عالەم
چون هەر هەوێنی عەشقە بۆ تیفلی دڵ دەمادەم
قەصدم وەهایە ئەمڕۆ خەرمانی خەم بە با دەم
بۆ غەیری پیری ساقیی سەر دانەخەم هەتا هەم
ئەگەرچی دڵ شکستە و زەلیل و رەنج بە با خۆم

رەقیب وەباڵی جورمت هەڵبگرە بۆ قیامەت
بێ سوودە بۆت بە بێ شك لەو رۆژەدا نەدامەت
رۆژێکە بۆ رەقیبان پڕ ترس و هەم مەلامەت
تەنها گرۆهی عەشقە دڵخۆش و سەر سەلامەت
لەو رۆژەدا نەبینی خاوەن مەقام و جا خۆم

یـاران ببیـنن ئـەمڕۆ گوڵشـەن کـە چـەن بـڵاوە
بە تیری غـەم کـە بـەرگی گـوڵ ڕەونـەقی نـەماوە
دەریـایی خـوێنی جـەرگی جەمعێکـە هەڵسـتاوە
(شەیدا)ی جەماڵی دولبەر، خنکاوی خوێن و ئـاوە
بێ دەست و دەسـتگیر و غـەوواص و نـاخودا خـۆم

***

## گەشانەوەی دڵ[*]

هەولێر ٢١- ٢٢/٩/٢٠٠١

بە نامەی جوان و رەنگینت موفەڕڕەح بوو دڵ و گیانم
ئەما ئازاری جەستەی پەست و ژاکاوم، شکا ژانم
بە بێشك بەرهەمی خامەت نموونەی دوڕڕ و گەوهەر بوو
بە چاوی دڵ سەرنجم دا بە وێنەی نرخی مەرجانم
وەڵامی نامەکەی پڕ سۆز و میهرت واجبە بۆ من
ئەبێ ئەرکی وەفاداریی بە حەق لابەم لەسەر شانم
ئەگەر هەر لێرەوە تاکو سلێمانیی بپێوم من
بە پێ هەم پێبەپێ، بێشك بە کەسری شەئنی نازانم
ئەزانم چونکە لانەی عاشق و ماڵی حەبیبانە
بە حەق سەرقافڵەی شارانە شار و موڵکی بابانم
منیش وەك ئەهلی دڵ ئەهلی وەفام و تەرکی غەم ناکەم
هەتا ئەو رۆژە دێ پەیکی ئەجەل، لەم شارە[1] میوانم
ئەگەرچی مات و بێدەنگم لە ماڵی غوربەتا ئەمما
بە دڵ موشتاقی شێوە و رەنگ و دیداری رەفیقانم
بە ناچاریی کە هەردەم عاشقی باخی گوڵە بولبول
منیش عاشق بە داری ئەرخەوانی گردی سەیوانم
مەکەن لۆمەی دڵی (شەیدا) کە رۆژ و شەو ئەناڵێنێ
کە دوورکەوتۆتەوە ئەمڕۆ لە یار و شاری جارانم

***

[*] ئەم هۆنراوەیەم لە وەڵامی نامەیەکی برای بەڕێز: کاك (عەدنان سەیوانیی) لە سلێمانیی نووسی.

[1] مەبەست شاری (هەولێر)ە.

# غەزەلخوانیی

هەولێر- ٢٠٠٣/١٠/٢٢

عەزیزم دیدە بیستوومە، فیدای ئەو زەرف و نامەت بم
لە ئەحواڵی منت پرسیوە ئاخۆ من سەلامەت بم
هەتا هەم من لە سایەی میهر و سیلەی چاوەکانی تۆ
ئەبێ مەمنوونی ئەم لوتف و دەم و لەفز و کەلامەت بم
ئەتۆ گوڵ، من لە عەشقی تۆ وەکو بولبول غەزەلخوێنم
بە گیان و دڵ فیدای ئەو قەولی شیرین و بەتامەت بم
ئەگەر بێت و ویصالی من لە ماڵی ئاخیرەتدا بێ
دەسا شەرتە بە شادیی چاوەڕێی رۆژی قیامەت بم
منی (شەیدا)ی جەماڵت چیم لە عەیش و نۆشی ژین داوە
بە سەرگەردانی گەردی مەقدەمی ئەم صوبح و شامەت بم

❊❊❊

## شەربەتی خوێن [*]

هەولێر- ١/٢/٢٠٠٤

گەرچی ئەمڕۆ جەژنی قوربانە لە عالەم، داخەکەم
دیمەنی خاکی وڵاتی من بەجارێ بوو بە خەم
چاوەڕێی فەسڵی بەهار و گوڵشەنێ بوو ڕۆژی عید
سەد حەیف زۆری نەبرد دەوری هەموو لێ بوو بە تەم
بولبولانی سەرچڵی گوڵشەن ئەوا شیوەن ئەکەن
مات و خامۆشن هەموو پەروانەکانی دەوری شەم
تیفلی بەستەزمان و بێتاوان و بێگەردی گەلم
بوو بە جێ پەنجە و نیشانەی دوژمنی خاکی حەرەم
وەك پەڕی ژاکاوی گوڵ، پاکی بە تیرێ هەڵوەریی
غەرقی خوێن و خاك و خۆڵی سووری گوڵشەن بوون بە جەم
سا ئەوەی زامی دڵی ئەم خاکە نەکولێنێتەوە
ڕەببی نوقمی گۆمی خوێنی سینە بێ سەر تا قەدەم
دەی ئیتر بەس شیوەن و ڕۆڕۆکە ئەی دڵ ڕۆژ و شەو
چونکە هەرگیز بێ چەقەڵ نابێ هەتاکو ماوە چەم
خۆ شەپۆلی خوێنی جەستەی ئەم شەهیدانەی وڵات
چەن ستەم کرداری ڕامالیی لەگەڵ جەور و ستەم

---

[*] ئەم هۆنراوەیەم بەهۆی تەقینەوە و (کارەساتی دڵتەزێنی ١/ی شوباتی ٢٠٠٤ لە شاری هەولێر) نووسی، کە بەرامبەر بوو بە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانی پیرۆز، بە داخەوە کۆمەڵێك هاوڵاتی بێلایەنی بێتاوان بوون بە قوربانیی، کە کاریگەرییەکانی جەنگی ناوخۆ ئەم کەلێنانەی لەنێو ڕیزی جەماوەردا دروست دەکرد، ئەم شیعرە لە سایتی (کوردستان نێت) ڕۆژی ١/٢/٢٠٠٨ بڵاوکراوەتەوە.

وا شەهیدانی وەتەن یەکدەنگ هەموو هاوار ئەکەن:
بەس بەفیڕۆدەن خەباتی ئێمە بۆ سوودی عەجەم
دەی ئیتر با یەکگرن ئەمڕۆ بە کوێرایی رەقیب
پایزی (زەرد)و بەهاری (سەوز)ی کوردستانەکەم
من لە (شەیدا)یانی رزگاریی وەتەنم و، میللەتم
هەر ئەبێ رۆژێ ببێتە خاوەنی ناو و عەلەم

***

# سەحرای عەشق

هەولێر- ٢٠٠٩/٢/١١

چەن ساڵە کە گیرۆدەیی عیشقی نەفەرێکم
بەم دەردەوە ئوفتادەم و وێنەی فەنەرێکم
عومرێکە لە سەحرایی غەمی عیشقی گوڵا من
ئەخولێمەوە دایم بە مەسەل دەربەدەرێکم
بولبول سیفەتم، عاشقی دیداری گوڵم من
بەینێکە لە ئەوزاعی چەمەن بێ خەبەرێکم
دایم غەمە قووتی دڵی زارم بە شەو و رۆژ
سەوداسەر و دێوانەم و ئاشفتە سەرێکم
مەجنوونی دەر و دەشتم و مەهجووری زەمانم
بیماری غەمی لەیلم و کوشتەی نەزەرێکم
ئەمڕۆکە بە شەوقی چەمەن و وەسڵ و لیقای یار
موشتاق و تەماداری بەهار و سەفەرێکم
قوربانە سەبا هەستە بڕۆ بیبە پەیامم
چون کوشتەیی روخساری گوڵ و لەب شەکەرێکم
هەر دەم کە گەیشتیتە حەرەمخانەیی شیرین
عەرزیکە بڵێ لەم دەمەدا من تەتەرێکم
ئەمڕۆکە لەلای کۆکەنی دێوانەوە هاتووم
هەر بۆیە منیش بێ سەر و ئیسم و ئەسەرێکم
ئەو عەرزی دەکردی منی (شەیدا)یی جەماڵت
هەر مونتەزیری لوتف و نەسیمی سەحەرێکم

## سەروەری عالەم ﷺ

هەولێر- ٢٠٠٩/٥/٦

سەبا دەستم بە دامێنت، بە با دە تۆز و گەرد و تەم
دەخیلم هەستە زوو حازربە، وادەی ڕۆینە بێ غەم
سەفەر هاتۆتە پێشت، ڕامەوەستە تووخودا ساتێ
بچۆرە خزمەتی گەورە و حەبیب و سەروەری عالەم
بە دڵ عەرزیکە ئەی فەخری جیهان و عالەمی باڵا
فەقیرێ شك ئەبەم عاشق بە رووی تۆ، بێ شیفا و مەرهەم
بە ڕۆژ و شەو هەموو گریانە کاری، دڵ بە بوریانە
لە دووریی شەوقی رووی تۆیە کە بۆتە هەمدەمی ماتەم
بە دایم شیودن و ئاه و فوغانە کار و پیشەی ئەو
خەو و خۆراکی لەم دنیایە داخ و حەسرەتە هەردەم
هەموو دەم چاوەڕێیە بۆ نەسیمی مەیل و لوتفێکت
بە خۆشیی عەشقی تۆ قوربان لە دنیادا ئەژی دەمدەم
ئەگەر مەیلێ بفەرمووی تۆ لەگەڵ ئەو تیفلی بێچارە
ئەسووتێ عاشقی (شەیدا) وەکو پەروانە بۆ رووی شەم

***

# ئاوازی دەروون

هەولێر- ٢٠٠٩/٥/١٥

دڵـە مـن عاشـقی لـەیلم، لـە چـەمەن خانـە دەکـەم
بۆیـە تەمسـیلی سـەری بولبـول و پەروانـە دەکـەم
سـەر و گیـان و دڵ و ژیـنم بـە فیـدای یـاری عـەزیز
من بە ئـاوازی دەروون پەرچـەمی گـوڵ شـانە دەکـەم
سـالیکی ڕێگـەیی عەشـقم وەکـو فـەرهادی زەمـان
ئارەزووی دەشت و دەر و ئـەو کـەژ و کێوانـە دەکـەم
سـاقییا دەسـتی مـن و دامـەنی چـاکت کـەرەمێ
مەرحەمەت فەرمو کە ڕوو لەو دەر و هەیوانـە دەکـەم
وەی چ وێرانـە بـە دەردی غەمـەوە مـاڵی دەروون
هەقمـە گـەر ئـارەزوی ئـەو بـاخ و گوڵسـتانە دەکـەم
هەم لەگەڵ دەنگی مەل و بولبولی خۆش لەهجە لە باخ
غەم نـەبێ، کـەی تەڵـەبی گوڵشـەنی بێگانـە دەکـەم
حەیفە تـۆ لـەم دەمـە بـەم شـێوەیە بڕوانـی لـە مـن
مـن نـە شـێتم نـە قسـەی هـەرزە و شـێتانە دەکـەم
مـن تـەماداری نەسـیمێکم و مایـل بـە گـوڵم
عومری خۆم هەر بە فیـدای دولبـەری جانانـە دەکـەم
شـەو کـە دێ تـارە بـەڵام ڕۆشـنە مـاڵی دڵـی مـن
سـەنگی شـەو بـەم دڵـە وێرانەیـە پێوانـە دەکـەم
هـەر شـەوە ڕاز و نیـازی دڵ و گـوڵ هەڵـدەگرێ
بۆیـە مـن ئـارەزوویی ئـەو شـەوە تارانـە دەکـەم

بـۆ ئـەوینی دڵ و گـوڵ فـەرقی نیـە دوور و نـزیك

ڕۆژ و شـەو یـادی جـەماڵی شـەم و پەروانـە دەکـەم

من کە عاشـق بـە گـوڵم، شـەرتی وەفـا لازمـە بـۆم

هەقمە گەر مەشقی عەشق بـەم دڵـە حەیرانـە دەکـەم

بـۆ ویصـالی گـوڵ و لـوتفێکی لەگـەڵ عالـەمی دڵ

منی (شـەیدا) گـەڕی ئـەو بـاخ و گوڵسـتانە دەکـەم

* * *

## شەریکی شین

هەولێر- ٢٠٠٩/٦/٥

ئـــەی دڵ ڕەفیقـــی ژیـــن و هـــەمڕاهی زینـــدەگانیم
ئـــەی دڵ شـــەریکی شـــین و ئـــاوازی نەغمـــەخوانیم
ئـەی دڵ قـــەرینی دەشـــت و ســـەحرا و بـــێ‌نیشـــانیم
بـــۆ قـــووتی ڕۆژ و شـــەوم و ئێـــوارە و بـــەیانیم
بـە غـــەیری غـەم بـە هیچـێك ئـەنیس و ئاشـنا نـیم

تـــۆ هەمـــدەم و ئەنیســـی ڕۆژ و شـــەوانی ئـــەی دڵ
تـــۆ کـــۆهی بێســـتوونی بـــۆ حـــاڵی عاشـــقی گـــوڵ
تۆ نەغمەخوانی بـاخی عەشـقی لـە سووچـی مەنـــزڵ
وەك بولبـــولی بـــەهاری دایـــم لەســـەر لـــق و چـــڵ
تـــۆی ئولفـــەتی ژیـــان و عـــومری هـــەموو جـــوانیم

هۆی شۆر و شـین و فیتنـە و ئـەم ناڵەناڵـە تـۆ بـووی
عاشق بە ماهی ڕووی ئەو مەعشووقی حاڵە تۆ بـووی
کێوی نەزەرگـەهی ئـەو حوسـن و جەماڵـە تـۆ بـووی
ئەو پـیری مـەی حـەقیقیی، جـام و پیاڵـە تـۆ بـووی
هـەر بۆیـە غـەیری ڕێـی ئـەم بـازاڕە شـارەزا نـیم

پشـــتم بـــە شـــارەزایی تـــۆ بەســـتبوو لـــە دنیـــا
وا نوقمی بـەحری غـەم بـووم، کـەوتم وەهـا لـە بنیـا
چی‌بکەم لە دەشت و سارای عەشـقا بـە تـاقی تـەنیا
لـەو چـاڵ و چـۆڵی مـەرگ و زوڵمـاتی تـار و ونیـا
لوتفـێ نەگـەر نـەکا گـوڵ، مـەفتوونی چـۆڵەوانیم

دەســـتم بـــە دەســـتی پـیری مەیخانـــە گرتبـــوو مـــن
نوستادی عەشـقی مـن بـوو بـۆ ژیـن و کـاتی مـردن
فیتنەی رەقیبی عـومرم لـێم بـوو بـە تـەوقی گـەردن
جـەرگ و هـەناوی کـردم بـەو تـیری ئـەنجن ئـەنجن
شـــێوا لـــە مـــن حـــەیات و ئاســـاری ئـــاوەدانیم

من عـاشقێکی (شـەیدا) بـەو حوسـنی نـارەوەن بـووم
کوژراوی تیری دەستی صەیـــادی نێـو چـەمەن بـووم
سەرمەستی بۆنی لالە و هەم یـاس و یاسـەمەن بـووم
لەو باخی عەشقی گوڵـدا مایـل بـە نەسـتەرەن بـووم
وا هاتـــە بـــەر نـــەمامی گوڵـــزاری جاویـــدانیم

***

# نەسیمی بەیان(*)

هەولێر- ٢٠/٧/٢٠١٠

نەسیم ئـەمڕۆ سـەحەر وەختـی بـەیانم
پـەیامی دڵ نـەبا، شـەرح و بـەیانم

لـەبۆ خزمـەت نـەجیب و شـاهزادێ
دڵارامێکـی سـەروەرزادەگانم

ئەکەم عەرزی سەلام و هەم تەشەککور
لە لوتفی ئـەو گوڵـەی شـیرین دەهـانم

کـە دووڕی (خـانمی خـێڵان)ی کـردە
دیـاریی، چـونکە مـن قـەدری ئـەزانم

بە لـوتفێکی وەهـا لـەو دوڕ میسـالە
لەگـەڵ ئـەم بێنەوایـەی بـێ‌نیشـانم

بەوەی ماوم لە خاطردا، عەجەب مـام!
ڕەویی خەم، هەم وەریی بەرگی خـەزانم

کـە مـن خـۆم هیچـم و هیچـم لـەبارا
نیـە، تـا بیکەمـە دیـاریی گـرانم

بـە ناچـاریی ئـەنێرم وەك وەفایـێ
بەرابـەر یادگـارانی شـەهانم

خـەڵاتی دووڕی (دیـوانی فـەنایی)
لەگـەڵ تەقـدیر و هـەم رازی نیهـانم

منـیش بۆیـە وەهـا شـیرینە لێـوم
وەیـا لـەم بەزمـەدا خامـە ڕەوانم

بە زاهیر چون لەسـەر ڕێبـازی نەقشـیم
قوتـابیی مەدرەسـەی عەشقی ئـەوانم

ئەنا من چیم و شیعر و بەرهەمی مـن
ئەبێ چیی بـێ! وەیـا مـن چـیی بـزانم

منی (شەیدا) لە ڕێگەی عەشقی گوڵدا
بەسەرچوو بـاخی عـومر و هـەم ژیـانم

***

(*) بەرێـز: جەنابی کاك (شێخ ئەسعەد نەقشبەندیی) لە سلێمانیی لەڕووی وەفـاوە هـەردوو کتێبـی (خـانمی خێڵان)و (دیوانی شیعری د. عابد سیراجەددین)ی بە دیاریی بۆ ناردم، منیش بەو هۆیەوە چەند نوسـخەیەکی (دیوانی شیعری مەرحوومی باوکم- دیوانی فەنایی)و ئەم چەند دێڕە شیعرەم پێشکەش کرد.

# غونچەی گوڵستان [*]

هەولێر- ١٩٩٧/٨/١٤

عـــەزیزم بێـــرە نێـــو ڕەوزە و گوڵـــستان | بە وێنەی غونچەیی نێو باغ و بوسـتان
گوڵستانی چەمەن ڕەنگینی (سـەعدی) | کە هۆیـــێکی نزیکـە بـۆ مەبەسـتتان
گوڵستانێ کـە ئـاوی روونـی ئـەو بـێ | حیکایـــەی زاهیـــد و یەکتاپەرســـتان
گوڵســـتانێ کـە ئـاوا بەهرەمەنـد بـێ | نەبێ فـەرقی لـەلای، هـاوین و زسـتان
ئەگەر سەرفی تەمەن کەی تـۆ لەگـەڵیا | ئەچیتە ریزی جـەمعی گـوڵ بەدەسـتان
ئومێـدم وایـە هـەردەم تـێ بکۆشـی | نـەگۆڕی دڵ بـە قەولـــی خۆپەرسـتان
بە ڕەنگێ بەهرەمەند بی لێـی عـەزیزم | ببی تێکەڵ بە ڕەنگ و بەزمی مەستان
لە سەرچاوەی حەقیقـەت سـەر دەرێنـە | بکۆشـە بـێ وچـان و دوور لـە وەسـتان
لەخزمـەت پـیر و ئوسـتادی مەحەبـەت | بچـۆرە ریـزی خـاوەن بـیر و هەسـتان
عەجەب دڵـگیرە ئـەم بـازاڕە، دیـدەم | نەکا چـاری نەخۆشـیی سـینە پەسـتان
ئەگـەر دڵ دوورە لـەو بـازاڕە ئـەمما | بە دایم هەوڵ ئـەدا بـێ دەستەوەسـتان
دڵەی (شەیدا) سیفەت تاکو نەگا پێـی | مەحاڵـە جـێ بهێڵـێ بـاغ و بوسـتان

❊❊❊

[*] ئەم هۆنراوەیەم لە وەڵامی نامەیـێکی برای خۆشەویستم: کاك (نەبەز غـەریب) لـە سـلێمانیی نووسـی، کاتێك نەیویست (گوڵستانی سەعدی) بخوێنێت.

# لانەی دڵ و گوڵ[*]

سلێمانیی- ١٣/١٢/١٩٩٨

بە گەشتی گوڵشەن و سەیرانی لانەی دڵ، بزێوم من

لە خۆشیی حاڵی دڵ، کەوتۆتە بار و خەندە لێوم من

یەکەم هەنگاوی من ئێستا لە (باخی بەختیاریی)دا

لە هەنگاوی دووەمدا وا (سلێمانیی) تەپێوم من

سەرەی هەنگاوی سێیەم هات و هەستم کرد کە دڵ یادی

سەفای جارانی کرد و پێی وتم ئێستا پەشێوم من

بەڵێ ئەم مەرحەلەش حەوشە و دەری (مزگەوتی گەورە)م بوو

کە لانەی خوێندنم بوو، ئێستە وا مەعدوومە نێوم من

ئەبینم یاری دێرینم نیە سۆراخی لەم دەورە

کەوابێ سەد هەزار حاشا لە گەنج و زێڕ و زێوم من

ئیتر بێ ئیختیاری خۆم (سلێمانیی) بەجێدێڵم

لەبەر ناسۆر و زامی سەختی دڵ وا قوڕ تەپێوم من

کە ئاوی ساف و بێگەردی چەمی (دووکان)ی بەختم دی

دڵەی زارم وتی ئێستاکە هەروەك داری سێوم من

شەویش داهاتووە ئەی دڵ بەسەر لاشەی حەزینمدا

لە گوندی (کانی وەتمان)ا خەریکی نوێژی شێوم من

---

[*] لەدوای تێپەڕبوونی نزیکەی ساڵێك بەسەر هاتنماندا بۆ شاری (هەولێر) بە ماڵەوە و یەکەم سەفەر و گەڕانەوەم بە سەردان بۆ شاری (سلێمانیی)، بە یادی کۆمەڵێك یادگاریی سەردەمی منالیی و قۆناغی سەرەتای تەمەنم لە گەڕەکی (سەرچیمەن)و (مزگەوتی شێخ بابە عەلی)و (مزگەوتی گەورە)و گەڕەکە دڵگیرەکانی تری شاری سلێمانیی، ئەم هۆنراوەیەم نووسی.

لەسەر شاخ و چیای بەرز و بڵندی (هەیبەسوڵتان)ا

خەریکی جادەپێوان و بڕینی شاخ و کێوم من

گڵۆپی شاری (کۆیە)ش وا دیارە وەك چرا دەگرێ

بەڵام خامۆشە شەوقی دڵ، لە هەوراز و نشێوم من

بە شاری کۆیەدا تێپەڕ ئەبم ئەی دڵ بە بێدەنگیی

شەویش تاریك و بێدەنگە، رەفیق و یاری خێوم من

لە رێگا گەر بپرسن لێم چییە ناو و نیشانی تۆ؟

بەشوێن لەیلا سیفاتێکا ئەڵێم مەجنوونە نێوم من

کە من (شەیدا)یی خاك و دیمەنی ئەو شارە دڵگیرەم

لە دووریی ئەو، بە دایم هەمنوشینی شکڵی دێوم من

* * *

# ڕەنجی دڵ

هەولێر- ١٩٩٩/٢/٢٠

ئەبێ دەرچێ لە دڵ! نازیز خەمی مـــن
وەیا پەیدا ببێ قەت مـــەرهـــەمـــی من

بکـــا سارێـــژی زامـــی کـــۆن و تـــازەم
ببێتە مـــایەیـــی خـــاتـــرجـــەمـــیی مـــن

لـــە گوڵشـــەندا ببیـــنم شـــێوەیی یـــار
هەتا سەر بێ ویصالی دەمدەمی مـــن

دەمێکـــە چـــاوەڕێی ڕۆژێکـــی خۆشـــم
کە لابـــا ڕەنـــگـــی دوود و ماتەمی من

پیاڵـــەی ژەهـــری تـــاڵی دەســـتی یـــارم
وەکو شەهد و عەسەل دێتە دەمی من

بـــەڵام داخـــی گـــرانم ســـەختە بـــەختم
هەمووددەم چـــاوەڕێم بۆ مەقدەمی، من

ئەگەرچی یاری من دڵڕەق بو ئـەی دڵ
هەتا سەر نەبوە لەیل و مەحرەمی من

لە نیوەی ڕێگـــەدا تـــەرکی دڵـــی کـــرد
فیراقی گوڵ بو هۆی عومری کەمی من

دەسا تۆش ئەی دڵـــەی پەروانـــە ئاســـا
هـــەتـــا مـــاوی نەڕەنجێنی شـــەمـــی من

ئـــەزانم مـــن بەشـــم هـــەر شـــینە دایـــم
ئەبێ هـــەر ڕەنجی دڵ بێ بەرهەمی من

دڵـــەی (شـــەیدا) ئومێـــدی وایـــە ڕۆژێ
نەوای نەی بێ لەجێی زیل و بەمی من

***

## خاکی کوردستان [*]

تورکیا- ماردین ١٩٩٩/٩/٢

وا لــه خــاکی تورکــەوه رووم کــرده ڕێگــەی مــاردین
ســا خــودا بیکــا نــەجاتی دا لــه دەســتی (مــاردین)
چــون ئــەبینم بێکــەس و بــێ نــازه کوردســتانەکەم
دڵ شکســـته و عـــاجزم، بێـــزار و زار و دڵ حـــەزین
ڕەببی ئەم خاك و وڵات و نیشـتیمانەی قـەومی کـورد
هەر بەهار و سەوز و گەش بێ، شاخ و داخی بێ بـرین
تەرکی تورکی لـێ بکەی، تا کـوردی دامـاو و هـەژار
تـا ئەبـەد بخرێتـه سـەر لێـوانی، خەنـده و پێکـەنین
من که (شـەیدا)ی خـاکی کوردسـتانم و مـافم هەیـه
هــەر ئــەبێ ڕۆژێ نــەمێنێ دوژمنـــی دڵ پــڕ لــەقین

***

---

[*] لەکاتێکدا که لەخزمەت باوکم و مامۆستا شێخ موحسین و کاك ستاردا سەفەری تورکیامان کرد و زۆرێـك له شوێنه دێرینەکانی شاری ئەستەمبووڵ و چەند جێگایەکی تری ئەو وڵاته گەڕاین، لـه گەڕانەوەمانـدا بـەناو شارەکانی کوردستانی تورکیادا ئەم پارچه هۆنراوەیەم نووسی، چونکه به ئاشـکرا نـەمانبینی کـه دەسـەڵاتی تورك زۆر جیاوازیی لەنێوان میللەتی کورد و نەتەوەی تورکدا کردووه و به جیا لـه شـاره تورکـەکان، زۆربـەی زۆری شاره کوردیـیەکان پەراوێـز خراون و هیچ جۆره خزمەتێکی بەرچاویان پێ نەکراوه، بۆیـه منـیش زامـی نەتەوایەتیم کولایەوه و بەدەم داخ و دەردەوه بەم شیعره و چەند پارچه شیعرێکی تر کوڵی دڵی خۆمم هەڵڕشت.

# خەمی شەوگار

هەولێر- ١٩٩٩/٩/٢٤

نەما بەزمی دڵ و دڵدارەکەی من
بەسەرچوو راز و نازی یارەکەی من

رەقیب دەستی رەشی هێنایە رێمان
بڕیی ئاوی گوڵ و گوڵزارەکەی من

بەفیڕۆ چوو هەموو عومری عەزیزم
لە دووریی دیمەنی دلدارەکەی من

نەما وەسڵ و زەمانە فەسڵی هێنا
بەجارێ بۆ دڵەی زامارەکەی من

شکا شووشەی مەی و بادەی مەحەببەت
لە مەیخانەی غەمی غەمخوارەکەی من

تەماداری نەسیمی بای سەحەر بووم
لە شاری یار و یاری شارەکەی من

وەرن یاران تەماشای حاڵی دڵ کەن
ببینن دیمەنی روخسارەکەی من

کە شێوە و رەنگی جارانی نەماوە
گەلێ دوورە لە رەنگی پارەکەی من

خودا رەحمێ بکا رۆژێ بنێرێ
دەوایێ بۆ دڵەی بیمارەکەی من

نەسیمێ بێ لەلای یاری فەرەح بەخش
بماڵێ گشت خەمی شەوگارەکەی من

هەتا کەی جێ دەسی هەروا بمێنێ
رەقیبی دڵرەق و غەددارەکەی من

لەسەر لاشەی زەعیف و زەردی (شەیدا)
بڕەنجێنێ دڵی نازارەکەی من

* * *

# باری خەم

هەولێر- ٢٠٠٠/١/١٥

گـەر دڵـێ تێکەڵ بـە بـاری خـەم نەبێ، بۆچیمە مـن
دیدەیێ سووتاوی شوعـلـەی شـەم نـەبـێ بۆچیمە من
یا لە رێـی عەشـقا بـە دڵ بـۆ مـەیلی یـاری دڵـڕفێن
دوژمنی سەرسەختی جـامـی جـەم نـەبێ بۆچیمە من
گـەردنێ ملکـەچ نـەبێ بـۆ شـیری دەسـتی دڵبـەری
یـا پـەتـی سـێـدارەیـی لا کـەم نـــەبـێ بۆچیمە من
ئەشکی خوێنینی دو چاوم گەر لـە لاشـەم سـەر نـەکا
یـا وەکـو سـەرچـاوەیـی زەمـزەم نـەبـێ بۆچیمە من
پەنجەیێ نەگرێ قەڵەم بـۆ وەسـفی روخسـاری حـەبیب
بـۆ شـکـانـە لێی‌گـەڕێ، پەند جەم نەبێ بۆچیمە من
سەرگوزەشتەم گەرچی مەسـتوورە لـە عالەمـدا بـەڵام
گـەر بـە وێـنەی داسـتانـی مـەم نـەبـێ بۆچیمە من
دەشت و سارای سینە گەرد و تـۆزی غـەم گرتوویـەتی
ئـاوی ئـەشـکـی دیـدەکـەم خوڕڕەم نەبێ بۆچیمە من
قەترە قەترەی بۆ نـەمامی بـاخی گـوڵ، سـوودی نیـە
خـوێنی جـەرگی لەت لەتم وەك چەم نەبێ بۆچیمە من
عاشقی (شەیدا) بە راسـیی عـەرزی ئـەهلی دڵ ئـەکا
کـۆڕی عەشقێ یـەك بەیەك مەحرەم نەبێ بۆچیمە من

***

# نەقشی دڵ[*]

هەولێر- ٢٥/٢/٢٠٠٠

بای سەحەر وا بۆ شیفای زامی دەروونی دڵبەران

کەوتە ڕێ بۆ وەسڵی ئەو یارانی دڵ وەك گەوهەران

گەرچی ئێستا نیشتەجێی شاری (دهۆك)ی چاوەکەم

بەس یەقینت بێ کە نەقشی، تۆ لە ڕیزی سەروەران

شاری (هەولێر)و (سلێمانیی) ئەبینم پێکەوە

چۆڵ و بێناز و کپن، وەك مالی بێدەنگ و هەران

بۆیە من پێنووسی شیعرم ئێستە وا کەوتۆتە گەڕ

چونکە دڵ کەوتۆتە یادی وەسڵی یار و یاوەران

پەنجەیێ نەگرێ قەڵەم بۆ وەسفی گوڵ یا حاڵی دڵ

هەر ئەبێ بشکێ بە دەستی زاڵم و ناداوەران

خۆ ئەگەر (شەیدا)ی جەماڵی گوڵ نەبم، چیم داوە من

لەم هەموو یاد و خەیاڵی شاخ و هەم دەشت و دەران

***

---

[*] ئەم پارچە هۆنراوەیەم بۆ (عەزیز)ی برام نووسیی لەکاتێکدا لە (کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی دهۆك) وەرگیرابوو و ماوەیەك بوو لەوێ مابۆوە، کە بۆ یەکەمجاری بوو لە ناز و نیعمەتی ماڵەوە دووربکەوێتەوە، وێنە و نامەکانی گوزارشتیان لە خەم و نارەحەتییەکی زۆر ئەکرد لەو شاری غوربەتەدا، بۆیە منیش بە مەبەستی دڵدانەوەی، ئەم چەند دێڕە شیعرەم بۆ نووسی.

## سەیلی سینە

هەولێر- ٢٠٠١/٧/١٥

وەرن یاران عیلاجی ئەم دڵەی مات و حەزینەم کەن
تەماشایێکی ئەم ماڵی خەراب و پڕ لە شینەم کەن
ئەڵێن بۆ ناگری! گەر عاشقی، عەشقت لە دڵدایە
ئەڵێم مەڕواننە چاوم، تەماشای سەیلی سینەم کەن
بە تیری دەستی جەللاد و رەقیبی دڵڕەقی عومرم
پەڕەی دڵ لەت بووە، سا سەیری ئەم گوڵهەڵوەرینەم کەن
لە زامی جەستەکەی زامار و بیمارم گەڕێن یاران
بریندای غەمم، تیماری ئەم زام و برینەم کەن
گرفتارم بەدەس فیتنە و گەڕی کابووسی دڵ نەمشەو
بە کۆمەڵ چارەییێکی ئەم شەوەی بێ رەحم و دینەم کەن
بەهاری عومری ژینم ئاگری میحنەت سەری پۆشیی
دەسا رەحمێ بە حاڵی ئەم ژیانی ئاتەشینەم کەن
منی (شەیدا)ی جەماڵی گوڵ هەتا هەم تەرکی ئەو ناکەم
دە ئەی یاران وەرن تەمسیلی ئەم عەشق و ئەوینەم کەن

* * *

## بەرگی غەم

هەولێر- ٢٠٠١/١٢/٢٣

لە ڕێگەی عەشقی دڵدا چەندە خۆشە دەربەدەرکردن
بە مەیلی لەیلەوە شیرینە بەرگی غەم لەبەرکردن
ئەوانەی کوشتەیی عەشقی حەقیقیی یا مەجازیی بن
هەموو بەشیانە شین و روو لە ڕێی بیم و خەتەرکردن
منیش هەروا لەژێر چەتری تەما تاڵیی غەمم نۆشیی
بەدەس عاشق کوژێکی دیدە غەمازی نەزەرکردن
ڕەقیب لێ ناگەڕێ عەشقی مەجازیی پێ بەپێ ببڕم
هەتا داری گوڵستانی حەقیقەت بێتە بەرکردن
گەلێ دڵخۆشە بەم بەزمەی کە گوڵ کردی لەگەڵ مندا
ئومێدی هەر جەفایە و بەرهەمی دڵ بێ سەمەرکردن
دەبا بەس بێ ئیتر، تا کەی بە تیری تیژی ژەهراویی
لە گوڵشەندا نیشانەی کون کونی سینە و جگەرکردن
لە ساحەی ئەهلی دڵدا بۆ ئەبێ بەم ڕەنگە بن یاران
لە مەجنوونێکی وەك من بێکەس و تەنها حەزەرکردن
لەلای مەجنوونی گیرۆدەی محەببەت چەندە دڵگیرە
بە خاك و خۆڵ و بەردەم دەرکی لەیلادا گوزەرکردن
لە دووریی عەشقی رووی شیرینەوە کۆکەن لە دنیادا
قوڵنگی خستە دەست و کەوتە دەشتی بێ ئەسەرکردن
ئەتۆش ئەی دڵ نەکەی کارێ کە ڕەنگی گوڵ بڕاکێنێ
لە ڕوویا فەخرە بۆ تۆ کاری قەڵغان و سوپەرکردن

لەگەڵ مەیل و رەزای یارت چ خۆشە بۆ بەقای تاسەر
بەرەو دوا مەنزڵی گۆڕی فەنا کۆچ و سەفەرکردن
دەخیل ئەی شەم خەیاڵی وا لە شەئنی شەوقی تۆ دوورە
بە بێ‌باکیی ئەوەندە عاشق و پەروانە دەرکردن
ئەبێ ئەم دەردمەندی بێکەسی (شەیدا)یە وەك بولبول
هەتا کەی هەر بەشی بێ ناڵە و شین و چەمەرکردن!

***

# گەنجینەی عەشق

هەولێر- ٢٠٠٢/٨/١٣

دو چاوی دولبەری خونچەددەمە خورشید و ماهی من

بە دایم سێبەری ئەبرۆی کەمانی، خەیمەگاهی من

ئەگەر لەم بەزم و ڕەزمی عەشقەدا تاوانە کاری دڵ

ئەبێ هەر تیری عەشقی دولبەرم بێ دادگاهی من

دەخیلم ساقیا قوربانی بادە و دەست و جامت بم

لە مەیدانی وەفادا هەر ئەتۆی پشت و پەناهی من

ڕەقیبی غەم حەسوودیی بردووە ئەمڕۆ بە شادیی دڵ

بە دوودی سینەکەم ڕەش بۆتەوە ڕەنگی سیاهی من

لە ساحەی عەشقی دڵبەردا گەلێ تاڵیی غەمم نۆشیی

ئیتر با بەس بسووتێ شاری ئەهلی دڵ بە ئاهی من

سەرم هەڵناگرێ هەرگیز لە ئەڵقەی گەردنم زیاتر

لە گەنجی عەشقدا باری غەمە تاج و کولاهی من

قوتابیی مەدرەسەی مەجنوونم و شاگردی فەرهادم

بەتەنها مەیلی عەشقی لەیل و شیرینە گوناهی من

سەریرم خاك و خۆڵ و گەر سەرینم کێوی کۆکەن بێ

ئیتر ئاخۆ ئەبێ چی بێ شکۆە و تەخت و جاهی من

جنوودی بێسنووری دڵ مەگەر هەر لەشکری غەم بێ

دەروونی پڕ فنوونی بەزمی عەشقە پادشاهی من

لە شاری گەنجی بەڵقیسی سەبا پێشەنگمە هودهود

قەتاری بولبول و پەروانەیە تیپ و سوپاهی من

شـەهیدی عەشـقم و لـەم باسـەدا شـاهیدمە خـوێنی دڵ
مەگـەر سـووراوی ئەشـکی دیـدە نابێتـە گـەواهی مـن!
خەتام کرد من لەخزمەت پیری مەی، پەروانـە فریاکـەوت
وتـی بیبەخشـە ئـەم بەدبـەختی بێچـارە لـە راهـی مـن
لە مەیخانەی غەمی لـەیلم ئەوەنـدەم شـین و زاریـی کـرد
وتـی نالایقـە ئـەم شـیوەنە بـۆ بارەگـاهی مـن
دڵەی (شەیدا) تـەماعی سـیلە چـاوێ بـوو کەچـی لـەیلا
بە بـێ‌بـاکیی وتـی مەڕوانـە بـۆ گۆشـەی نیگـاهی مـن

****

## هەڵوەرینی گوڵ

هەولێر- ٢٠٠٣/١٠/٢٧

چەندە بێ رەحم و وەفا بوو دڵبەری عەیاری من
قەت نەبوو جارێ لە رووی رەحمەت بکا تیماری من
گوڵ کە وادەی هەڵوەرینی بوو لە باخی عەشقدا
بولبولی دڵ کەوتە نەغمە و شیوەن و هاواری من
ئێستە وەرزی پایز و گوڵ هەڵوەرینە بۆیە وا
رۆژ و شەو فریاد و ناڵەی کۆچی لەیلە کاری من
گەوهەری دڵ سەد حەیف وا کەوتە بەردەستی رەقیب
بۆیە دایم پڕ غەم و دەردە دڵەی زاماری من
گەردنی تازا نەبێ هەرگیز لە تۆڵەی قەتڵی دڵ
ئەو جەفاکردار و دڵ ئازارەکەی خونخواری من
من لە (شەیدا)یانی بەزمی ئەهلی دڵم و تاکو هەم
هەر مەدیح و وەسفی لەیلە گوڵشەنی ئەشعاری من

***

# تەلاری عەشق

هەولێر- ٢٠٠٧/٥/٢٢

کە ماڵی دڵ تەلاری عەشقە یاران لێم مەڕووخێنن
بە بێباکیی ئەوەن پەردەی حەیا لەم ماڵە مەدڕێنن
لە بەرچاوی رەقیب ئەحواڵی دڵ هەرگیز مەپرسن لێم
کە ئەم شێواوی بەزمی عەشقی لەیلە، وازی لێ بێنن
بەئومێدم ئەمن ببمە شەهیدی عەشق و جیلوەی گوڵ
ببینم بولبول و پەروانە وێنەی گوڵ بنەخشێنن
لە گوڵشەن شیوەنێ بەرپا بکەن بۆ ماتەم و شینم
ئەگەر هات و رەقیب ویستی نیگاکا چاوی دەربێنن
هەتا بەو چاوە نەڕوانێ بە شادیی بۆ مەلوولیی من
هەقی قەتڵی منی بێچارە لەو بەدکارە بستێنن
چ بێباکن لە قەتڵی عاشقی سەرمەستی بۆنی گوڵ
ئەوانەی جامی شووشەی ماڵی دڵ بەو تیرە ئەشکێنن
کە زاخاوی بە خوێنی دڵ دراوە بۆیە وا فێرە
بە کوشتن، تا هەموو یارانی ئەهلی دڵ بفەوتێنن
رەفیقان قەت بە کەم سەیری ئەوینی دڵ مەکەن ئێوە
نەکەن کاریێ رقی ئەو لەیلی دڵ ئازارە هەستێنن
تەماعی عاشقی (شەیدا) مەتاعی گوڵشەنی حوسنە
دڵەی زارم ئەنیسی رێی سەفەرمە لێم مەڕەنجێنن

***

## ئەشکی دیدە

هەولێر- ٢٠٠٨/١/٢

بۆیە وا گوڵزار و باخی عومرەکەم سووتاوە من

چون بە خوێنی جەرگ و ئەشکی دیدە ئاوم داوە من

هەقمە گەر ئەم لالەزارە من بپارێزم بە چاو

ئەزیەتی زۆرم لەپێناوی گوڵا کێشاوە من

پایزی زەردم بەبێ بارانی گوڵشەن بردە سەر

نم نمی ئەشکم لە جێگەی ئەو، هەموو خوێناوە من

من نیازم بوو بپێوم پێ بەپێ رێبازی عەشق

داخەکەم فریانەکەوتم، دەرفەتم کەم ماوە من

چونکە هەرگیز لەم جیهانی عەشقەدا بەختم نەبوو

ماهی روخساری حەبیبەم رۆژ و شەو گیراوە من

قەت نەبوو رۆژێ بچێژم تامی عەشق و وەسڵی دڵ

گەنج و سەرمایەی ژیانم هەر بە غەم فەوتاوە من

هەرگیزا ساتێ لە سووتانی دەرون باکم نیە

ئاگری عەشقم بە کوورەی سینە داگیرساوە من

سا دەخیلم ساقیا هەر تۆی ئومێد و شەوقی دڵ

بۆیە هاتووم و پەنام ئەمڕۆ بە تۆ هێناوە من

تا لە رێبازی محەببەتدا وەکو یارانی تر

مەرحەمەت کەی بەم دڵەی زارم کە لێم رەنجاوە من

خۆ ئەگەر مەیلێ بەلای ئەم عاشقی (شەیدا) نەکەی

هەر بە دایم غەم لە داری گەردنم ئالاوە من

***

## نوێنەری میللەت[*]

هەولێر ١٤- ١٥/٦/٢٠٠٩

گەل ئەگەر رەخنەی هەبێ لەم پەرلەمان
ئەو کە بۆتە نوێنەری لەمپەر لەمان

هەقیەتی دایم بپرسێ زۆر و کەم
لەو کەسانەی وا لەنێو کاری کەمان

کەی رەوایە مووچە زۆری و کاری کەم
هەر بلێن زیادی بفەرموون پارەمان

جەلسەیێکم دی لە وەختی نیجتیماع
دایە حاجی خەوتبوو وەك قارەمان!

چاوەڕێی چیی بم دەسا من لەو کەسە
نوێنەری خەوهێنەری ئاخرزەمان

کۆمەڵێکی دیکە گۆرانیی دەڵێن
یا خەریکی هەڵهەلە و رەقس و سەمان

هەر ئەوەندەی ماوە بێنن سەریەسەر
تیپی مۆسیقا لەگەڵ تار و کەمان

ئەمشەویش بەزمێکی سەیرم دی بە چاو
دیمەنێکی وا عەجایبتر لەمان

سەیرئەکەم بۆتە کەسێکی وێنەکێش
دەستە خوشکی بێ‌خەمی خاتوو خەمان

وا خەریکی وێنەکێشانە لەنێو
هۆڵ و قاعەی پەرلەمانی لانەمان

قوڕ بەسەر ئەو میللەتەی تا ئێستەکەش
چارەنووسی وا لەژێر دەستی ئەمان

ئەو گەلەی چاوی لە دەست و بەرهەمی
کۆمەڵێکی وایە، یاخود هەر هەمان

رێگە بگرن کۆمەڵێکی تازەتر
هەر لە هەوڵی پوول و پارە و دیرهەمان

نوێنەرێ گەر حاڵی ئاوابێ ئیتر
چاوەڕێی چی بم لە موفتیی گەورەمان

چاوەڕێی وەزعێکە گەل، تا خۆری کەل
دەرکەوێ، رۆشن بکا تا رێگەمان

نەك بەتەنها وێنەکێشان و قسە و
گفتی مفتی سەر زمان و دەمدەمان

یا بە بینینی خەوی خۆش و خشەی
باڵەخانەی دوور لە وێرانی زەمان

من کە (شەیدا)ی نیشتیمانم تاکو هەم
وا لە دڵما ئەم وڵات و خاکەمان

---

[*] لەو شەوەدا لە یەکێك لە کەناڵەکانی راگەیاندن دیمەنی کۆبوونەوەیەکی پەرلەمانی کوردستانم چاوپێکەوت کە ئەندامێك خەریکی وێنەکێشان بوو، بۆیە بە خەمی ئەو دیمەنانەوە ئەم پارچە شیعرەم نووسی.

# بولبولی بێ پەڕ

هەولێر- ٢٠١٠/٩/٥

لەم باخی عەشقی لەیلەدا، ئەو بولبولانەی بێ پەڕن
گوڵ نایەڵێ هەرگیز کە وا بێ خەم بە باخا تێپەڕن
چون بولبولی بێ باڵ و پەڕ لەم بەزم و ڕەزمی عەشقەدا
باڵی وەریوە و یەك بەیەك هەر دژ بە ئاژاوە و شەڕن
جەمعی ڕەقیبانی چەمەن بۆ داخ و دەردی عاشقان
تا هەن لە ژینا هەرهەموو گورگن لەنێو پێستی مەڕن
هەرگا ڕەقیبی دلڕەقی بێ ڕەحم و سۆز و دڵ بەقین
لەم باخەدا گەر دەرکەوت، یاران دەبێ زوو دەرپەڕن
چون هەر ئەوە خاوەن شەڕ و جەللادی نێو صەحنی چەمەن
هەر بۆیە گیرۆدەی دەسی فیتنەی ڕەقیبی بەدفەڕن
نایانەوێ گوڵ بەو هەموو بەزمەی ڕەقیب رابچڵەکێ
وەرنا هەموو مەردن بەحەق، خاوەن دەسن، شێری نەڕن
تا باخی عەشقی گوڵ هەبێ بۆ ئەهلی دڵ لەم ژینەدا
وەك بیلبیلەی دوو چاوی سەر بۆ ئەم مەقامە بێ زەڕن
ئەو وائەزانێ ئەهلی دڵ دوورن لە حاڵ و هەم مەقام
یا کۆمەڵێکی بێ دەس و بێ ماڵ و حاڵن، یا لەڕن
ئەمما بەحەققەت کۆمەڵی عوششاقی مەجلیس هەرهەموو
دایم لەبەر بارانی لوتف و میهری لەیلادا تەڕن
وەك عاشقی (شەیدا) بە رووی لەیلایی عیشقی عالەمێ
هەردەم لەبەردەم تیشکی رووی خۆری گولا کوێرن، کەڕن

***

# ئاهی دڵ و فوغانی بولبول

هەولێر- ١٩٩٨/٤/١٠

مــن رەفیقــی بولبــولم بــۆ ئــاه و نالــەی رۆژ و شــەو
ساتێ شینی خۆم ئەگێڕم ساتێ گــوێ ئــەگرم لــە ئــەو
ئــەو فوغــان و داد و بێــدادی وەرینــی گــوڵ ئــەکا
من بــە تــیری غــەم برینــدارم بــە وێنــەی بــاڵی کــەو
ئەو ئەگەر شادبێ بە دیــدار و جــەماڵی رەنگــی گــوڵ
دەســبەجێ سارێــژ ئــەبێ زام و برینــی کــۆن و نــەو
بەس بە ناکامیی لە خاکی غوربەتا مــەجنون ســیفەت
عاقیبەت دووری ئەبینم بەختی من هەســتێ لــە خــەو
من لە گوڵشەندا دەمێ بوو چاوەڕێی یەك موژدە بــووم
باخــەوان هــات و وتــی چــاوی نســیبت چــۆتە خــەو
شەرتە بێ روخساری گوڵ من قەت نەکەم سەیرانی باخ
هەر بە خۆم و ئەم دڵەی (شەیدا) بکەم من کۆچ و رەو

***

# ئەسرینی شەو

دهۆك ٢٠-٢١/١/٢٠٠٠

به كوڵ ئەگری دڵـم شـێتانه ئەمشـەو
لـه دووریی دولبەری جانانـه ئەمشەو

فـەقیر و مـات و بێـدەنگ و خـەزینم
نەتیجەی رەنجی من گریـانـه ئەمشەو

ئەگەرچـی ئەشـكی چـاوم نادیـاره
بـەلاّم سینەم وەكـو سیروانه ئەمشەو

به یادی شـەوقی جـارانم لەگـەڵ گـوڵ
خـەیـاڵـم تولفەتـی جـارانـه ئەمشەو

له صەحنی گوڵشەنا دڵ بولبولـێ بـوو
كـه بـۆ ئـەوكاته وا حەیرانه ئەمشەو

بـەڵێ بـۆ یـاری وەك شـەمعی دلاّرا
ئـەسووتێم مـن وەكو پەروانه ئەمشەو

له سـاحەی نائومێـدیی مـەیلی دڵـدا
تـەپ و تـۆزی غـەم و زریانه ئەمشەو

جگەرسووتاوی رێگەی عەشـقی لـەیلم
گـڕی نـاهـم ئـەڵێی بوركانه ئەمشەو

وەكو بولبول له دووریـی گـوڵ ئـەناڵم
كـه لاشەم وێڵ و سەرگەردانه ئەمشەو

هـەزاران عاشـقی وەك مـن پەرێشـان
ئـەكـەن شینی گوڵ و رەیحانه ئەمشەو

ئەگەرچی كەس نیه وەك من بچێـژێ
غـەمی ناسۆری ئەم هیجرانه ئەمشەو

بەلاّم من هـەر بەتـەنها شـین ئـەگێڕم
كه بـەم شێوه بەشم هەر ژانه ئەمشەو

مەكەن مەنعم له غەم توخوا رەفیقـان
غـەمـی لەیلم لەجێگەی نانه ئەمشەو

لەبـەر ناڵـەی دڵـەی سەحرانوشـینم
بەتـەنـها هـەر منم دێـوانـه ئەمشەو

بەدەس جەوری رەقیبی بـاخی عـومرم
دیـار و مـاڵـی دڵ وێـرانـه ئەمشەو

فیدای ئەو پەنجەیـەم رێگـەم نیشـان دا
بـڵـێ دڵـدارەكـەت میـوانـه ئەمشەو

خەلاّتی من لـەبۆ ئـەو موژدەبەخشـە
سـەر و سامان و رۆح و گیانه ئەمشەو

وەكو مەجنوونی وێڵ و شێته (شەیدا)
كـه وا كەوتۆته ئـەم كێوانـه ئەمشەو

***

## سۆزەی سەحەرگا

هەولێر- ١٣/٥/٢٠٠٠

نەوید ئەی یاری گـولڕەنگم، مـنم کوشـتەی جـەماڵی تـۆ

بـەجارێ شـێت و حـەیرانم بـە جـەزبی چـاوی کـاڵی تـۆ

فیراق و دوور لە دیدەی مەستی تۆ ئەی دیدە با بـەس بـێ

ئیتر بـا مەوسـیمی گوڵـزار و گـوڵ بێـت و ویسـاڵی تـۆ

بە یادی شەوقی جارانت لەگەڵ دڵ چـیی ئەقـەومێ! گـەر

لـە رووی نـاز و وەفـاوە لـێم بپرسـی چـۆنە حـاڵی تـۆ؟

ئەگەر مـەیلت هـەبوو لایـێ بـەلای ئـەم بێنـەوادا کـەی

قسـەی نـەرمی رەقیبـی دڵ نەشـێوێنێ خـەیاڵی تـۆ

هەتا کەی مات و بێدەنگیی! مەگـەر نـازانی ئـەی جانـا

لە عومرت کەم ئەکا بۆ نەگبەتیی من مـاه و سـاڵی تـۆ

لـە سووچـی خەسـتەخانەی عیشـقدا سـاتێ عـیلاجم کـە

نیگـاهی تـۆ شـیفایە، خـاوەنی فـەزڵ و کـەماڵی تـۆ

هـەتا مـن هـەم لـە دنیـادا بـە عەشـقی تـۆ گرفتـارم

لە ئەوودڵ رۆژی وەسڵت بوومە کوشتەی زولف و خاڵی تـۆ

بە رێکەوت رێم لە رێی مەیخانە کەوت ئەمما نەبوو رێگـەم

بـە بـێباکانـە پـیری مـەی وتـی لاچـۆ منـاڵی تـۆ

لە دەشـتی بێکەسـیی، کەشـکۆڵ لـەکۆڵێکی زەلـیلم دی

وتـی چـارت ئەکـەم بـێشـك، وتم بۆچـی، قـەڕاڵی تـۆ!

کە مـن کەوتوومـە نێـو داو و کەمەنـدی دیـدە فـەتتانێ

چ سوودێکی هەیـە بـۆ حـاڵی مـن هەگبـەی بـەتاڵی تـۆ

به ناچاریی پەنام هەر بردە بەر سۆزی سەحەرگاهم
کە بەشکو هودهودی باخی سەبا بێنێ هەواڵی تۆ
دەخیلت بم نەسیمی صوبحی دڵداران، پەیامی دڵ
ببە بۆ خزمەتی یارم؛ بە حەق سروەی شەماڵی تۆ
ئیتر با بەس لەوە زیاتر دڵەی دێوانە و (شەیدا)
بناڵێنێ بەدەس تیری غەم و کۆچ و زەواڵی تۆ

***

# پەروانەی شەم

هەولێر ٥-٦/٦/٢٠٠٠

ئەی پەپوولەی بەر چراکەم بۆچی وا بێتینی تۆ!

خۆ لەبەرچاوم دیارە شێوەکەی رەنگینی تۆ

دیمەنی نەقش و نیگاری لاشەکەت رەنگاوە وا

بەس ئەبینم رەنگی زەردت شاهیدە بۆ قینی تۆ

رەنگ و رووت خامۆش و مات و گریەبەخشە بۆ منیش

سەرگوزەشتەی خۆم ئەبینم من لە شەونالینی تۆ

خۆزگە ئەخوازم بە حالت چون شەمێ بۆ تۆ هەیە

رووت لە شەوقیدایە، بۆ مەعشووقەکەت پەرژینی تۆ

بۆ عیلاجی دەردی غەم یا مەرهەمی زامی دەروون

نوور و شوعلەی شەمعە بۆ شەوقی دڵ و تەسکینی تۆ

بەس منی تەنها لە دەشتی بێکەسیدا دەربەدەر

رۆژ و شەو نالێنمە، دووربێ لە شێوەی شینی تۆ

عاشقی (شەیدا) لە دووریی یاری جەرگی کون کونە

بۆیە وا عەودالە بۆ شەوقی شەم و ناسینی تۆ

***

# دڵدانەوەی دڵ

نەستەمبووڵ- خانەقای حەزرەتی شێخ ٢٠٠٠/٧/٢٧

وتم ئـــەی دڵ مەکـــە رۆڕۆ، کـــە خـــاوەن دڵبـــەرێکی تـــۆ

لە سایەی سەروەریی یـارت بـەبێ شـك ئەفسـەرێکی تـۆ

هەموو عومری عەزیزت سەرفی وەسڵی دیدە مەستێ کرد

ئیتر تا کەی ئەناڵی! هەمـدەمی لـەب شـەککەرێکی تـۆ

هەموو یارانی ئـەهلی دڵ ئەگـەر کوشـتەی رەقـیبن، خـۆ

بـە دەسـتی دولبـەرت کـوژراوی زامـی خەنجـەرێکی تـۆ

ئەبێ قووتی شەو و رۆژت بە مەیلی دڵ هـەموو غـەم بـێ

ئەگەر تۆ راس ئەکەی لەم بەزمەدا غـەم پـەروەرێکی تـۆ

بـەڵێ لـەیلی ئـەتۆ خـاوەن مـەقام و عیـزز و جاهێکـە

وەکو مەجنوونی وێڵی دەشـت و دەر، سەوداسـەرێکی تـۆ

چیە باکت لە غەم! گەر تـا قیامـەت بـاری سـەر دڵ بـێ

لـــە بـــازاڕی مەحەببەتـــدا کـــە تـــەنها زەڕگـــەرێکی تـــۆ

لە سووچـی مۆزەخانـەی عەشـقدا قـەدرت هەیـە، ئـەمما

بـە حـاڵی خـۆت نـەزانیوە، عـەجایب گەوهـەرێکی تـۆ

کە تۆ (شەیدا)یـەکی لـەم راهـی عەشـقی دولبـەرا دایـم

بە وێنەی عەندەلیبی گـوڵ، کـە رەحمـەت نـاوەرێکی تـۆ

***

## خوێناوی دیده

سلێمانیی- ۲۰۰۰/۸/۲۸

دڵــم هێنــا بــه تیغــی دیــده وردم کــرد و هــەم دەرچــوو
خەیاڵم خستە سەر بەرگ و پەڕەی گوڵ، خـاری غـەم دەرچـوو
بەتــەنها لــەم هــەموو گوڵــزارەدا مــن هــەر گــوڵێکم بــوو
لە صوبحێکا شکۆفەی کرد و شـەق بـوو گـوڵبـەدەم دەرچـوو
لــە بــاخی عەشــقی دولبــەردا ئەوەنــدەم نــاوی گــوڵ دا مــن
کەچیی بەم حاڵەوەش خوێناو و ئەشـکی دیـدە کـەم دەرچـوو
کە ساتێ گوێم لە سۆز و سـاز و نـەی دڵ گـرت و تـێ‌فکـریم
ئەمیشم هەر بە مەستیی بیست و زەنگی زیل و بەم دەرچـوو
ئومێــدێکم بــە دڵ بــەو پــیری مەیخانــەی حەقیقــەت بــوو
بــەڵام داخــی گــرانم خــاو و بــێ‌لوتــف و کــەرەم دەرچـوو
لــە ناوێنــەی دڵا وێنــەی نیگــاری حــەق خــەتی کێشــا
بە تیری گوڵ کە شووشەی دڵ شـکا، حیـبر و قەڵـەم دەرچـوو
وتــی خــوێنم بــە خامــەم دیــەنی دولبــەر بنەخشــێنە
وتم ئۆخەی کـە رازیـی بـوو بـە خـوێنی دڵ لـە دەم دەرچـوو
لە مەدح و وەسفی لەیلم رۆژ و شەو هەرچـی کـە مـن کـردم
لــەلای دڵــداری بــێ‌ڕەحــم و وەفــا پــاکی بــە زەم دەرچـوو
شــوکور بــۆ حــاڵی زارم عـاقیبــەت دولبــەر دڵــی چـابوو
ئــیتر فیتنــەی رەقیبــی دڵ لــەنێو مــاڵی حــەرەم دەرچـوو
لە وەسـفی عەشـق و سـۆز و دڵ فیـداکاریی منـی (شـەیدا)
وتــی ئەلحــەق غــولامێکی نــەجیب و موحتــەرەم دەرچـوو

✲✲✲

## جەژنی ویصال

سلێمانیی- ٩/٢/٢٠٠١

وەرە بولبول چەمەن رەنگینە ئەمڕۆ
هەموو ساحەی دڵم بێ شینە ئەمڕۆ
شوکور دوورم لە ژێردەستیی رەقیبم
ئەگەرچی ئەو دڵی پڕ قینە ئەمڕۆ
فیراق و دەردی غەم بەینێکە ئەی دڵ
دەمی جەژن و ویصال و ژینە ئەمڕۆ
دەمێ بوو دڵ زەلیلی دەستی غەم بوو
بەبێ دڕکی غەم و ناڵینە ئەمڕۆ
دڵەی بولبول سیفەت پڕ شەوق و زەوقە
تەماعی وەسڵ و گوڵ بینینە ئەمڕۆ
کە وا هاتۆتە شاری حەزرەتی یار
لەبۆ گوڵ هەروەکو پەرژینە ئەمڕۆ
وەکو (شەیدا)یەکی کۆکەن میسالێ
بەئومێدی لیقای شیرینە ئەمڕۆ

***

## دەردی جودایی(*)

هەولێر- ٢٠٠٢/١/٧

عەزیزم بۆچی تۆ مەیلت بە دایم هەر جودایی بوو
لەبەرچی ئیختیاری ئەم دەمەت بێ ئاشنایی بوو
ئەگەر لەم وەختەدا بێ میهری یو تۆران و رەنجانت
دەلیلی دیەنی دێوانە یا دەردی گەدایی بوو
لە گەنجینەی غەمی تۆدا بە دڵ خۆ دەوڵەمەندێ بووم
سەراسەر خەزنەیی دنیا لەلام بێ نرخ و بایی بوو
لە ئەوودڵ رۆژی وەسڵی تۆوە بێ شك بووم و ئەمزانی
ویصالی من بە دیدەی مەستی تۆ، بەهرەی خودایی بوو
چ حاجەت بوو کە تۆ تەرکی دڵەی دێوانەکەی جانا
فیراقی تۆ لەداخی من، عەزیزم بێ وەفایی بوو
بەناهەق رەنجی چەن ساڵەت بە با دا دولبەرا سەد حەیف
شکاری پەنجەکەت تەمسیلی کاری نارەوایی بوو
چ بوو کاری رەقیبی دڵ وەها کاری لە قەلبت کرد
ئەفەرمووی گەر نەزانینم لەبەر ناشارەزایی بوو
بە تیغی دیدە لەو وەختەی کە تۆ جەرگی منت پەی کرد
بە کەیف و شەوق و زەوقی دڵ، رەقیب ئەو رۆژە شایی بوو
لە سایەی پەرچەمی شێواوی تۆدا فرسەتی هێنا
بە ئاسانیی بە خوێنی سووری من دەستی حەنایی بوو

---

(*) ئەم هۆنراوەیە لە ژمارە (٣٤، ٣٥)ی گۆڤاری (پەیڕەو) ساڵی ٢٠٠٤ بڵاوکراوەتەوە.

ئەگەرچــی موددەتێکــە مــن بــە عەشــقی تــۆ گرفتــارم

نیــازم لــەم هــەموو گریــان و شــینە، دڵنــەوایی بــوو

ئەمن نەمویست بە رەنجانی دڵـت عـومرم بـە کۆتـا بـێ

ئومێـدی مــن لــەپێناوت بــە گیـان و دڵ فیـدایی بــوو

لە شەوقی رەنگی گوڵ بـوو ناڵـەیی بولبـول لـە گوڵـزارا

خــەلاّتی عاشـقی (شـەیدا) خـەم و ناڵـەی جـودایی بـوو



# مۆزەخانەی عەشق

هەولێر- ٢٠٠٢/٧/٢

دڵێکم بوو لە ساحەی سینەدا هەمڕەنگی مینا بوو
گوڵێکم بوو لە باخی دڵ لە وێنەی یاسەمینا بوو
جەلابەخشی مەهی تابانی شەو هەڵهات و نووری دا
لە جیلوە و شەوقی حوسنی، دڵ بە وێنەی طووری سینا بوو
لە گۆشەی مۆزەخانەی عەشقدا رۆژێ بە چاوی دڵ
عەجایب گەوهەرێکم دی لەنێو شووشەی ئەوینا بوو
لە وەختێکا سەبا موژدەی ویصالی دولبەری هێنا
کە تیفلی دڵ لە گەرمەی ناڵە و گریان و شینا بوو
شوکور ئەمڕۆ شیفای هات و نەویدی گەییە فریادی
وەکو بولبول لە گوڵزارا لە وادەی گوڵچنینا بوو
سەرم کێشایە نێو مەیخانە رۆژێ بێخەبەر دیتم
بە بێباکانە پیری مەی لە حاڵی پێکەنینا بوو
ئەبینم خاتەم و مۆری سولەیمانی لەدەستدایە
لەسەر جێ تەختی شاهانە و لەنێو بەخت و نگینا بوو
چ باکم بوو لە غەم یا تیر و تانەی یار و بێگانە
منی مەجنوونەکەی دێوانە تا لەیلا لە ژینا بوو
لە خۆشیی وەسڵی دولبەر تا بەهار و وەرزی گوڵ رۆیی
دڵەی (شەیدا) سیفەت بۆ گوڵ لە بەزمی نەی ژەنینا بوو

***

